# کورد
# لە کتێبی
# (الیعقوبي) و (الطبري)دا

نووسینی
پرۆفیسۆری یاریدەدەر
د. احمد عبدالعزیز محمود
کۆلێژی ئاداب/ زانکۆی سەلاحەددین

وەرگێڕانی
محمد حسن سەرگەینیڵی





# کورد لە کتێبی (اليعقوبي) و (الطبري)دا


نوسینـــــــــــــی | د. احمد عبدالعزيز محمود

وەرگێڕانـــــــــــی | محمد حسن سەرگەینێڵی

بڵاوکردنـــــــــەوەی | نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر

خـــــــــــــەت | نەوزاد کۆیی

نەخشەسـازی بـەرگ : | أمين مخلص

نەخشەسازی ناوەڕۆك: | جمعه صديق كاكه

نـۆرە و سـاڵی چـاپ: | یەکەم ١٤٣٦ك - ٢٠١٥ز

تـــــــــیراژ: | ١٠٠٠ دانه

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٤٩) ساڵی ٢٠١٤ پێدراوە







نوسینگەی تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس

Mob: +964 750 440 51 22

Tel: +964 750 818 08 66

www.tafseer-pub.com

tafseeroffice@yahoo.com

# چەند سەرەقەڵەمێك

(بەناوی خوای بەزەیی زۆر و بەردەوام)

دوای ئەوەی ئاشنایەتیمان لەگەڵ نووسەری بەڕێز پەیدا کرد، هەمان ڕۆژ ڕووی لە ئێمە نا، وەکو نووسەر و وەرگێڕ، ئەم کتێبەی ئەو بۆ سەر زمانی شیرینی کوردیی وەربگێڕین، کە هەڵێنجاوی دوو کتێبی مێژوویی گەورەی ئیسلامی (التأريخ الطبري) و (التأريخ اليعقوبي).

ئێمە بێ ڕامانی ئەم داوایەی ئەومان قبوڵ کرد، چونکە (مێژوو) خۆی ئاوێتەی ژیانە، هەگبەی ئەزموونی ڕۆژگارە، مێژوو چەند پرەنسیپەکی هەیە نەگۆڕە، وەکو یاسایە سروشتییەکان دووبارە دەبنەوە، مێژوو ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو پێکەوە دەبەستێتەوە. میللەتی کوردیش، گەر بیەوێ لەناو گێژاوی سیاسی و تائیفی ئیمڕۆ خۆی رزگار بکات و کەشتی خۆی بەرەو کەناری ئارامیی ببات، دەبێ سوود لە ڕابردووی مێژووی خۆی وەربگرێت. ئەو هەڵە سیاسییانەی لە سەردەمی ئومەوییەکان و عەبباسییەکان کردوویەتی، نابێ دووبارەیان بکاتەوە.

بێگومان سیاسەتی ئیمڕۆی عێراقیش، گەر هەمان هەڵە سیاسیەکانی ئومەوییەکان و عەبباسیەکان دووبارە بکاتەوە، ئەویش بە دەردی ئەوان دەچێت و دەڕوخێت...

لەم کتێبەدا سێ لایەن دەبینی لە سەردەمی ئومەوییەکان و عەبباسییەکان دا لە گۆڕەپانی سیاسیدا دەوری جموجۆڵ دەبینن و داوای مافی خۆیان دەکەن، کوردەکان و عەلەوییەکان و خەواریجەکان، کورد لەم نێوانەدا جار هەیە بە تەنیا و جار هەیە لەگەڵ خەواریجەکان و جار هەیە لەگەڵ عەلەوییەکاندا ڕێك کەوتووە بۆ روخاندنی ئومەوییەکان و عەبباسیەکان، بۆ لابردنی ستەمی ئەوان و بەدەست هێنانی دەسکەوتی ئاینی و سیاسییەکانی.

لە زۆرێ لەو هەوڵانەیدا بەهۆی هەڵەی سیاسی شکست خواردوو دەبێ، نموونەمان زۆرە لەو بوارەدا، کە لەم کتێبەدا دەیانخوێنینەوە.

**وەرگێڕ** ٢٤/ ٥/ ٢٠١٢

# کورد له کتێبی مێژوویی (یەعقوبی)دا
## مردن (۲۹۲ك/ ۹۰۵ز)

### پێشەکی

زیادڕەوی ناکەین، ئەگەر بڵێین شارستانی ئیسلامی، یەکێکە لـە دەوڵەمـەنترین شارسـتانیەکان لـە ڕووی کۆکردنـەوە و نووسـینەوەی مێـژوودا، بەشـێوەیەك هـەر لێکۆڵەرێکی زانستی مێژووی ئیسلامی تـاووتوێ بکـات، لـە زۆری ئـەو هـەموو نووسین و کۆکراوە مێژووییانە، واقی وڕ دەمێنێ، کە لە جۆرەها بواردا نووسـراونەوە و هەر چاخێك لە چاخەکانیش، مێژوونووس و سەرچاوەی تایبەتی خۆی هەیە.

گومانی تێدا نیە گرنگی ئەو بڕە بێ هەژمارەی نووسـراوە مێژوویـیە عـەرەبی و ئیسلامیانە لەوەدا خۆی حەشار دەدات، کە زۆرێك لەوانە گشت لا گرەوەیـان هەیە لە باسکردنی بابەتە مێژوییەکاندا.

مەبەست لە گشت لاگرەیی ئەوەیە، ئـەو سەرچـاوە مێژوییانـە تـەنیا مێـژووی گەلێك، یان ڕەگەزێ لە دانیشتوان جەخت ناخاتە سەر، کە لەسەر حیسابی گەلان و ڕەگەزەکانی تر بێت، وەك ئەوەی لەگـەڵ (کـورد) دا هاتۆتـە ئـاراوە، بـەڵکو ئـەو کۆکراوە مێژووییانە، هەوڵیان داوە هەموو گـەلان مـافی خـۆی بـدەنێ، ئـەزموونی تەواوی میللەتان و گەلان باس بکەین، نەخوازەلا ئەو گەلانەی چوونە ژێر بەیـداخی ئیسلام و دەوڵەتەکەیەوە و، لەسەر عەرەب چەقی بەستووە.

ڕوونترین نموونە لەسەر تیراسای گشتگیریی لە تۆمارکردنی مێژوودا لە (مێژوی (یەعقوبی))دا بەرجەستە دەبێ، کە لە (احمد) کوڕی (ابی یعقوب) کوڕی (واضح)ە، ئەو مێژوو نووسە بە ((یەعقوبی)) ناسراوە لە (٢٩٢ك/ ٩٠٥ز) کۆچی دوایی کردووە، ئەمەش لەو کتێبانە دادەنرێ، کە گشت لاگرەوەن لە تۆمارکردنی مێژووی ئیسلامیدا.

بێگومان کورد لە ناو کۆمەڵگای ئیسلامییدا، دوای موسڵمان بوونیان شوێنی خۆیان هەیە، لەبەر ئەوە شتێکی نامۆ نییە سەرچاوە ئیسلامییەکان بەهەر شێوەیەك بێ، شتێك دەربارەی مێژووی ئەو گەلە تۆمار بکەن، گەر لەگەڵ گەلانی تری وەکو عەرەب و فارس بەراوردی بکەین، مێژووی (یەعقوبی) لەو بارەوە ڕێزی پێشەوە دەگرێت.

لەم توێژینەوەیەدا پێگەی کورد لە کتێبی ((یەعقوبی)) دا هەوڵی دەرخستنی دراوە، ئەمەش لە ڕێگای هەڵێنجانی ئەو هەواڵانە و پەیوەستە بە کورد و زێد و نیشتمانیانەوە. گرنگی ئەو توێژینەوەیە لەوە دایە هەنگاوێکی پێویستە بۆ تاوتوێ کردنی مێژوی کورد لە چاخە یەك لە دوا یەکەکاندا، بە مەبەستی زانینی ئاستی بەشداری کردنیان لە ڕوداوە مێژووییەکان و دامەزراندنی شارستانییەکدا.

**توێژینەوەکەم کردووە بە دو بەشی سەرەکییەوە:**

بەشی یەکەم: پێناسەی (یەعقوبی)ی و ناوەڕۆکی کتێبەکەی و ڕێباز و مەسەلەکانی تری پەیوەست بەو مەسەلەوە.

بەشی دووەم: تەوەری هەرە گرنگە لە تاووتوێکردنەکەدا، باسی کورد دەکات لە مێژوی (یەعقوبی)دا هەر لە چاخە دێرینەکانەوە.

زیاتر جەخت دەخاتە سەر کورد لە سەردەمی عەبباسیدا لە ڕێگای ڕونکردنەوەی سیاسەتی عەبباسیەکانەوە لە بارەی کوردەوە، پاشان ئەو بزووتنەوانە

باس دەکات لێرە و لەوێدا لە کوردستاندا لەو چاخەدا بەرپا کراون، دوایی ئەو بزوتنەوانە دەخاتە ڕوو، کە کورد لە دژی خەلافەتی عەبباسیدا پێوەیان هەڵساوە، بە تایبەتی لە ڕۆژانی (هارون ڕەشید) و (مەئمون) و (واثق) و (موتەوەکیل) دا، بە مەبەستی رزگار بوون لەدەست چەوسانەوە و ستەمی کاربەدەستان و والیەکانی عەبباسیەکاندا، لەبەر ئەوە پێشوازییان لێ کردوون و چوونە ناویانەوە.

# لێکۆڵینەوەی یەکەم

## یەکەم: پێناسەی (یەعقوبی) و کتێبە مێژووییەکەی:

(یەعقوبی) بە ئەحمەد کوڕی ئـەبی (یـەعقوبی) کـوڕی جەعفـەرکوڕی وەهـەب کوڕی (واضع الإخباري) عەبباسی ناسراوە.

(یەعقوبی) نەژادی عەبباسی هەڵـدەگرێ[١]، چـونکە دەدرێتـە پـاڵ بنەماڵـەی عەبباسی دەسەڵاتدار. ئەو نەژادە لە (الواضـح)ی باوکییـەوە بـۆی ماوەتـەوە، کـە یەکێ بووە لە مەوالییەکانی خەلیفە (ابی جعفر المنصور) (مـردن١٣٦- ١٥٨ ك ) [٢]، یەکێ بووە لە نزیکانی ئەو و لەو کارە گرنگانەی پێی سپێردراوە متمانەی پـێ کراوە [٣].

(یەعقوبی) لە شاری (بەغدا) چاوی بە دنیا هەڵهێناوە و لەوێش گـەورە بـووە، بەڵام بەزوویی بۆ (ئەومینیە) بەجێی هێشتووە[٤].

تافی لاوی لای (طـاهر)یەکان بەسەر بردووە[٥]، لە ڕاست بەرواری کۆچی دوایـی (یەعقوبی) بۆچوونی جیاواز هەیە، (یاقوت الحموی) پێی وایە لـە سـاڵی (٢٨٤ك/ ٨٩٧ز) مردووە [٦]. هەندێ کتێبی نوسراو و ئینسکلۆپیدیا و سەرچـاوە مێژوویـیـە نوێیەکان پشتییان پێ بەستووە[٧].

بەڵام ئەگەر بڕوانینە کتێبی (مشاكلة الناس لزمانهم) نووسراوی یعقوبی، لێکۆڵەر دەبینێ، مێژووی خۆی بە خەلیفە (المعتضد) کوڕی (احمد) کوڕی (المتوكل) کۆتایی هێناوە، کە لە (٢٤٧ك/ ٨٦١ز) کۆچی دوایی کردووە، ئەمە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە، کە (یەعقوبی) لە نزیکەی (٢٩٢ك/ ٩٠٥ز) کۆچی دوایی کردووە.

(یەعقوبی) پیشەی نووسینی گرتە ئەستۆ، بە تایبەتی لە دەڤەری (طاهر)یەکان، ماوەیەکی زۆر لەوێ ماوەتەوە [٩]، (یەعقوبی) بە گەشتیارێکی فرە سەفەر لەقەڵەم دەدرێ، بە چەند گەشتێکی زۆردژوار زۆر هەڵساوە، لە هیندستانەوە بۆ مەغریب و وڵاتانی تر ڕۆیشتووە.

لەماوەی ئەو گەشتە زۆرانەدا، زانیاری مێژوویی و جوگرافیی زۆر کۆدەکاتەوە، ناتوانرێ مرۆڤ پێویستی پێیان نەبێت [١٠].

زانراوە (یەعقوبی) مەزهەبی ئال و بەیتی دوانزە ئیمامی هەڵدەبژێرێ، باپیرە گەورەی (واضح) مەزهەبی شیعەی ئیمامی قبوڵ کردووە و بۆی دڵسۆز بووە، وەك لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە [١١].

کوڕەکان و نەوەکانیشی ئەو بڕوایەیان هەڵگرتبوو، (یەعقوبی)ش، تا سەر ئێسقان لە ڕووچوو بوو، بەڵام تاڕادیەك مام ناوەند بوو. ئەو ڕاستییانە لە نووسراوەکانیدا دەگوێزێتەوە، لە مێژووکەیدا زۆرترین ڕەنگدانەوەی هەیە، لە کاتی وەفاتی ئیمامەکاندا ، بە درێژی باسی هەڵومەرجی ئەوانی کردووە.

لە کاتێکدا باس لە ئیمام عەلی دەکات (کرم الله وجهه) ،کەلەو سێ کەسانەی دادەنێ لە سەر دەستی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موسڵمان دەبن [١٢].

لە کاتێکدا ڕووداوی (سەقیفە) دەگێڕێتەوە، لەگەڵ باسی ئەبو بەکری سەدیق (ڕەزای خوای لەسەر بێت) دا باس دەکات، زۆری نەمابوو (عەلی) کاندید بکرێ، لەبەر ئەوەی لە موسڵمان بووندا لە ڕیزی پێشەوە بوو، بەنو هاشمەکان لە خەڵکی تر

لەپێشتر بوون[١٣]. ئـەم مەسـەلانە و مەسـەلەی تـریش ئـەوە پیشـان دەدەن، ئـەو دەستی بە ڕێبازی ئال و بەیتەوە گرتبوو و شیعە بووە.

(یەعقوبی) ئاستێکی هزری بەرزی هەبووە، زانیارییەکی فـراوان و هەمەلایـەنی هەبووە، ڕۆشنبیرییەکی گشتگیریی هەبووە، توانیویەتی بەهرەیەکی زانستی زۆر بـە لێکۆڵەران ببەخشێ، ببێتە بەردی بناغەی هزری وەچەکانی داهاتوو[١٤].

ناودارترین نووسراوە زانیارییەکانی، بەپێی باسکردنی (یاقوت الحموی) ئەوانەن:

١- کتێبی مێژوویی گەورەی ناسراو بە (تأریخ الیعقوبی).

٢-کتاب البلدان.

٣-أسماء الامم السالفة.

٤-مشاکلة الناس لزمانهم.

کتێبی یـەکجار زۆرەو زۆربەشـیان چـاپکراون، ، تـەنیا کتێبـی (اسمـاء الأمـم السـالفة) نـەبێ، لـە ڕیـزی کتێبـە لەدەسـت چـووەکان دادەنـرێ ، کـەتا ئێسـتا دۆزراوەتەوە.

## دووەم: مێژووی (یەعقوبی) لە ناوەڕۆك و ڕێبازیدا

ئـەم کتێبـەی بـە گـرنگترین کەلـەپوری (یـەعقوبی) دادەنـرێ لـە نووسـیندا، نوسراوەکە پوختەیەکی بە سوود و گشتگیری مێـژووی جیهانییـە بـەر لـە هـاتنی ئیسلامدا، ئەنجا مێژووی ئیسلامی تا ساڵی (٢٥٩ك/٨٧٢ز) باسکردووە.

ئم کتێبە لەبەشی یەکەمی چەند بابەتێکی لەخۆ گرتووە، بە چیرۆکی (تـەورات) دەستی پێکردووە، دوایی وەسفی چوار (ئینجیل)ەکەی کردووە، تیشـکی خسـتۆتە

سەر مێژووی عەرەب بەر لە ئیسلامدا، هاوکات ناچار بووە هەندێ بابەتی ڕۆشنبیری گشتگیر باس بکات، لەکاتێکدا لەبارەی مێژووی سیاسییەوە ، شتی کەمی لەبەر دەست دابووە، لە بارەی گریکییەکان و هیندییەکان و عەرەب و هەندێ بابەتی گشتیی قسەی کردووە، نموونەی کتێبەکانی (ئەڕستۆ) و (ئەبۆقرات) و شاعیرانی جاهیلی[١٦].

بەپێی ڕیزبەندی زەمەنی کەسایەتییەکان ڕێکی خستوون، وەکو پادشایان و پێغەمبەران و کەسایەتییەکانی تر. بەمەش (یەعقوبی) ئاسۆی ڕێگا بۆ مێژوونووسان دەکاتەوە بۆ فراوانکردنی زانیاری مێژووییان، چونکە خۆی بە هیچ قەید و بەندێکەوە نەبەستۆتەوە، لێرە و لەوێ کاری تێ بکات. لە ئاسۆیەکی ڕۆشنبیری فراوانی ڕوانیوە، بۆیە تێبینی دەکرێ ڕاپۆرتێکی درێژی لەبارەی دەستکەوتی گریکی زانستی و هزری تایبەت کردووە[١٧].

((یەعقوبی)) هەوڵی داوە شێوازی لە پێشتر دانان هەڵبژێرێ لەنوسینی مێژووی ئیسلامیدا، دوای وردبوونەوە و لەبێژنگدانی گێڕانەوە و بەسەرهاتەکانی هەڵیبژاردون، بینیویە مێژونووس و ژیاننامەنووسان لە گێڕانەوە و هەواڵەکان و ساڵەکان و تەمەنەکاندا یەکڕانین، بۆیە هەوڵیداوە لێکیان بدات و کۆی گێڕانەوەکان وەربگرێ.

لەبەر ئەوەی (مەرجلیون) لەبارەیەوە گوتویەتی: ( بەنادیاری وەسفی ڕووداوەکانی کردووە)[١٨]. چونکە ئەو هەلەی نەبووە ڕاڤەی تەواوی هۆیەکان بکات، ئەو سەلیقە گەورەیەی نەبووە، کە ئەو کارە گەورانە هەڵبژێرێ، کەسایەتی ئەو لە گێڕانەوەدا بخەنە ڕوو.

(یەعقوبی) ڕێبازێکی نوێی دۆزییەوە بۆ نووسینەوەی بابەتە مێژووییەکان و پاداشتی ڕاستییان، هەڵسا خۆی دوورگرت لە ڕێبازی (الاسناد) واتە: بڵێ فلان لە فیساری گێڕاوەتەوە، چونکە بەر لەو، (الاسناد) لە مێژوودا لە مەسەلە گرنگەکاندا دامەزرابوو[19].

بەکارهێنانی نووسینی (المرسلی) بەبێ (الاسناد) وەکو ڕێبازێك کە یەکەمجار ئەوانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە بەکاریان هێناوە، مێژوونووسانیش لە کۆتاییدا پشتیان پێ بەست[20].

(یەعقوبی) ڕێبازی (سالێرەتی) بەکار نەهێناوە، بەپێی ڕیزبەندی ساڵەکان ڕووداوەکانی نەنوسیوەتەوە، ئەو ڕێبازەی بەکاری هێناوە، کە دەوڵەتان، یان چەرخی خەلیفەکان و کاربەدەستان بەڕێوەی دەبەن، واتە: بەپێی بابەت بەندی دەڕوات.

نوسینی ڕێبازەکە بەپێی کەسانە، بە پێچەوانەی ئەو ڕێبازەی ساڵ بەندی بەکاردێنێت. ئەو ڕێبازەش لە چاو ڕێبازی پێشوتر باشترە و بێ وێنەیە[21]، چونکە ڕێزبەندی کردووە و دیزاینی بۆ داناوە، ((یەعقوبی)) لەو پێشینانەیە ئەو ڕێبازەیان کردۆتە بناغە بۆ دیزاین کردن و ڕێکخستنی بابەتە مێژوویەکان، بۆیە مێژوی (یەعقوبی) لەو بارەوە لە تەواوی کتێبەکانی تری مێژووی دەوڵەتان و چاخەکان لە پێشترە[22].

یەکێ لەو ڕەخنانەی ئاڕاستەی (یەعقوبی) دەکرێ ئەوەیە، هەواڵ و باسەکانی لەبارەی چاخی خۆی بە کورتی هێناون، زانیارییەکانی لە بارەی ئەو چاخەی تێیدا ژیاوە، کەمو کورتی تێدایە وەك پەیکەرێکی ڕووت لێی گەڕاوە. بەڵام لە ڕاست چەرخی ئومەوی (٤١-١٣٢ك)/ (٦٦١-٧٤٩ز)و چەرخی عەبباسی سەرەتایی (١٣٢-٢٤٧ك/٧٤٩-٨٦١ز) پڕ زانیاری[23].

دیسان زۆر شەیدای (عەلی) بووە (سەلامی خوای لێ بێت) و گرنگی زۆری بە وەچاغی ئەو داوە لە پێشەوایان و هەندێ بەلای شیعەدا شکاوەتەوە، بە تایبەتی کاتێ دەربارەی خەلیفەکانی ڕاشیدین و ئومەوییەکان قسە دەکات، دیسان هەندێ ڕووپامایی لە کاتی باسکردنی عەبباسیەکاندا و سیاسەتیان پیشان دەدات، ئەمەش سەرەنجێکی تری بۆ ئەوەمان ڕادەکێشێ، کە مەیلی ڕێبازی عەلی کردووە(٢٤).

# لێکۆڵینەوەی دووەم

## هەواڵ و باسی کورد و کوردستان لەمێژووی ئەودا

(یەعقوبی) لە مێژووەکەیدا، تەنیا کەمێك باسی کوردی کردووە، زیاتر گرنگی بە باسی دەوڵەتان و کاربەدەستان و ئەو مەسەلانەی پەیوەستن بەو شتانەوە داوە، هەرچی گەل و میللەتی ترە، کە دەوڵەتی تایبەتیان دانەمەزراندووە وەکو (کورد) لەبەرئەوە ناویان هاتووە، پەیوەندییان بە مێژووی دەوڵەتی ناوەندییەوە بووە.

(یەعقوبی) لە ڕاست ئەو مەسەلانەی پەیوەستن بە کورد، هەوڵی خۆی چڕ کردۆتەوە لە باسکردنی ئەو هەواڵانەی پەیوەندیان بە لایەنی بەڕێوەبردنەوە هەیە لە هەرێمەکان و ویلایەتەکانی کورددا، وەکو دانان و لابردنی والییەکان و میرنشینەکان، پاشان دیاریکردنی بڕی سەرانە (الخراج) و زانستی تری پەیوەست بەو هەرێمانەوە[٢٥].

نابێ لە یادمان بچێ ئاماژە بۆ زۆرێك لە بزووتنەوەکان و شۆڕشەکانی نەیاران و ئۆپۆزسیۆنەکان دەکات، کە لە کوردستاندا لە دژی خەلافەتدا هەبوونە، بەتایبەتی بزووتنەوەی شوراتەکانو (الخوارج) و بزوتنەوەی (بابکی خورەمی) و هتد، کە کوردستان دەکەنە مەڵبەند و پەناگای بزووتنەوەکانیان. (یەعقوبی) بە هەندێ نادیارییەوە باسیان دەکات و تەواوی هەقی خۆیان پێ نادات، کە لێکۆڵەر بتوانێ لە هەموو لایەکەوە بە تێر و تەسەلی سودی لێوەربگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ لێکۆڵەرێك نییە پێویستی بە (مێژووی (یەعقوبی)) نەبێ، گەر بیەوێ هەندێ

لایەنی مێژووی کورد له سەردەمی ئیسلامیدا بزانین، دەبێ بۆ (یەعقوبی)ش بگەڕێتەوە، پێویسته ئاماژه بەوەش بکەین، که (یەعقوبی) سۆزی بۆ کورد نەبووە، وەك له کتێبی (البلدان)دا ئەو ڕاستییەی تێدا دەخوێنرێتەوە، لەم کتێبەدا بە (عێراق) دەستی پێکردووە، چونکه بیروڕای وایه عێراق: (ناوەڕاستی دنیایه و ناوکی زەوییه و خۆرئاوایەتی له فراوانی و گەورەییدا، ......ئەو وەکو....کورد نییه، ئەو چیایه وێرانه بەفراوییه، که خانەی کوردە دلڕەقەکانه)[٢٦].

## یەکەم: کورد و کوردستان له سەرەتای ئیسلامدا

(یەعقوبی) هیچ زانیارییەکی تەواو له بارەی مێژووی کوردستان نادات بەر له ئایینی ئیسلامی پیرۆزدا، تەنیا ئەوەندەی لەبارەی کوردەوە باسکردوون پەیوەندی بەماوەی دەسەلاتی (ئەردەشێری کوڕی بابك)ەوە هەیە[٢٧]، دامەزرێنەری دەوڵەتی (ساسانی).

پاش ئەوەی لایەنێ لە داگیرکاریی و جەنگەکانی باس دەکات لەگەڵ (ئەردەوان)دا، که دوا پادشای (ئەشکانیەکان)ە، ئاماژه بەو نامەیه دەکات بۆ (ئەردەوان)ی ڕەوانه دەکات و هەڕەشەی لێدەکات و پێی دەڵێ: (تۆ سنوری خۆت بەزاندووە ئەی کوردی گەورە بوو له تاوڵ (خیوەت)ی کوردەکاندا، کێ تاجی نایه سەرت و وڵاتەکەی دایه دەستتەوە)[٢٨]؟

پاشان به درێژی باسی هەوڵەکانی (ئەردەشێر) دەکات بۆ بەهێزکردنی پایەکانی دەوڵەته تازەکەی، که دەتوانێ له ماوەیەکی کورتدا کوردستان داگیر بکات، به تایبەتی هەرێمی (جەزیرە)[٢٩] و (ئەرمینیا) و (ئازەربیجان)[٣٠].

پاش ئەوەی (یەعقوبی) ئاماژه به هێرشەکانی هۆزەکانی (خەزەر) دەکات بۆ سەر ئازەربیجان لەسەر دەستی پاشای ساسانی (بەهرام جور) کوڕی یەزگورد)[٣١].

دیسانەوە ململانێی نێوان خودی ساسانییەکان و نێوان ڕۆم لەسەر کوردستان باس دەکات[٣٢].

بێگومان ئەو ململانێیە، شوێنەوارێکی نێگەتیڤ و شوێن یەخەی لەسەر ژیانی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتووری کوردیدا پەیدا کرد، باسێکی داگیرکاری (نەوشێروان)ی ساسانی کردووە، بۆ دەڤەر و شارە کوردییەکان، نەخوازەلا دەڤەری (جەزیرەی فوراتی)، کە ئەو کاتە سەر بە (ڕۆمە بێزەنتییەکان) بووە، بەپێی قسەکانی (یەعقوبی)، بەچەند کارێکی کوشتن و تالان هەڵدەستێ لە دژی دانیشتواندا[٣٣].

لە مێژووی (یەعقوبی)دا، هیچی تر لە ڕاست کوردا باس نەکراوە بەر لە هاتنی ئاینی ئیسلامدا. بەڵام ئاماژەی بە مەسەلەیەکی زۆر هەستیار کردووە، ئەویش ئەوەیە دەڵێ: کوردستان دەکەوێتە نێوان ساسانیەکان و ڕۆمەکانەوە. ئاماژە بەوە دەکات، کە سنوری وڵاتی (ڕۆم) لە تخوبی (فورات)ەوەیە، تا تخوبی ئەسکەندەرییە.

گەورەترین شاریان لەو سەردەمەدا (ئەلرەها)[٣٤] بووە لە خاکی جەزیرەدا، ئەو ناوچانەی لە شانشینی ڕۆمدا نەبووە، لە ئیسلامدا بووە ، خاکی جەزیرەی گرتەوە لە (حەران)[٣٥] و (ئەلرەها) و تەواوی کورەکانی)[٣٥]، هەرچی پارچەکانی تری کوردستان بوو، سەر بە ساسانیەکان بوو.

دیسان (یەعقوبی) باس دەکات: (ئەو دەڤەرانەی فارسەکان بۆ خۆیان دابڕیبوون و دەسەڵاتیان بەسەردا دەشکا، لە ناویدا لە کورەی (الجبل) بریتین لە: {هەمەدان، نەهاوەند، حەلوان، ماسبذن، مهرجانقذف، شارەزور، سامغان، ئازەربیجان، ئەهواز و کورەکەی، و کورەی عێراق، و چل و هەشت ناوچەی هەبووە لەسەر فورات و دیجلە)}[٣٧].

(یەعقوبی) بە کورتی ئاماژەی بۆ خۆ بە دەستەوەدانی کوردستان کردووە بۆ دەسەلاّتی خەلافەتی ئیسلامی، لە کاتێکدا ئاماژە بە ڕووداوی (جەلەولا) دەکات[٣٨]، ساڵی (١٩ك/٦٤٠ز) لە ڕۆژانی عومەری کوڕی خەتتابدا (ڕەزای خوای لێ بێت) (١٣-٢٣ك/٦٣٣-٦٤٣ز)[٣٩] لە نێوان لەشکری موسڵماناندا بە سەرکردایەتی سەعدی کوڕی ئەبی وە قاص) و ساسانیەکاندا بە سەرکردایەتی یەزگوردا)[٤٠].

هەروەها چۆن ئەم شەڕە بە دۆڕانی ساسانیەکان تەواو دەبێ و موسڵمانان دێنە ناو کوردستانەوە، ئەم شەڕە بە بەرژەوەندی موسڵمانان تەواو نەبوو، تا ساڵی (٢١ك/٦٤١ز)، لەو ساڵەدا موسڵمانان شاری (نەهاوەند)[٤١] یان گرت، کە بە دەروازەی کورەی چیا (الجبال) دادەنرێ، دوای ئەوە بۆ تەواوکردنی گرتنی کورەی چیا (الجبال)[٤٢] موسڵمانان لە ساڵی (٢٢ك/ ٦٤٢ز) هەرێمی ئازەربایجانیان گرت، دوایی هەرێمی (ئەهواز)[٤٣] لە ساڵی (٢٣ك/ ٦٤٣ز)دا دەگرن.

پاشان ڕوویان کردە (جەزیرە) و (عیاض) توانیان (الرقە)[٤٥] و (سرج)[٤٦] و (الرها) و (نصیبین)[٤٧] و تەواوی شارەکانی جەزیرە بگرن.

لە بارەی چۆنیەتی گرتنیان، (یەعقوبی) باسی کردووە: (ئەمە بە ڕێککەوتن بوو، بەزۆری یان، سەرانە لەسەر زەوی و گەردنی خەڵکی دادەنا، هەر مرۆڤێ، دەبوایە چوار پێنج شەش دینار بدات).

لە سەردەمی خەلیفە عوسماندا (ڕەزای خوای لی بێت) (٢٣-٣٥ك/٦٤٤-٦٥٦ز) موسڵمانان توانیان هەرێمی (ئەرمینیا) و شارەکانی وەکو (البیلقان) و (برذعة)[٥٠] و شارەکانی تری کوردستان بگرن[٥١].

دوای ئەوەی (یەعقوبی) هیچ شتێکی تری تایبەت بە کورد و کوردستان باس نەکردووە، لە چاخی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا (ڕەزای خواییان لی بێت)، تەنیا

هەندێ ئاماژەی بەو والییانە کردووە، کە  لە ناوچەکانی کوردستاندا دەست نیشان کراون[٥٢].

(یەعقوبی) لە ڕاست کورددا، لە سەردەمی دەسەڵاتی ئومەویدا بە بزووتنەوەی (فروة) کوڕی (نوفل الاشجعی)[٥٣] دەستی پێکردووە، کە یەکێ بووە لە شوڕاتە خەواریجەکان لە دژی پێشەوا عەلی میری بڕواداران (سەلامی خوای لێ بێت) ڕادەپەڕن (٣٥-٤١ك/٦٥٦-٦٦١ز)[٥٤]. پاشان (فروة بن نوفل) لە شارەزووردا لادەبات[٥٥].

لە کاتێ هەواڵی شەهیدبوونی ئیمام عەلی (کرم الله وجهه) پێ دەگات و دەزانێ موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (٤١-٦٠ك ٦٦١-٨٧٩ز) هاتۆتە سەر کورسی دەسەڵات، ڕوی کردە خەڵکی شارەزور و خەڵکێکی زۆری کۆکردەوە، ویستی ڕوو لە (کوفە) بکات، بەڵام موعاوییە توانی بە بەکارهێنانی خەڵکی کوفە ئەم بزووتنەوەیە تێك بشکێنێت، فروە کوژرا و مەترسی لەسەر موعاوییە نەما)[٥٦].

گرنگترین شت کە (یەعقوبی) باسی کوردستانی کردبێ لە سەردەمی دەسەڵاتی موعاوییەدا، بڕی ئەو سەرانە (الخَراجَ) یە بەسەر ناوچە کوردنشینەکانی دا فەرز کردبوو، گومانی تێدا نییە ئەم زانیارییە ئابوورییانە، گرنگییەکی گەورەیان هەیە بۆ زانینی داهاتی کوردستان و دەوڵەمەندییەکەی لە سەردەمی ئومەویدا، کە هانی دەسەڵاتدارانی ئومەوی داوە بایەخی پێ بدەن، هەموو هەوڵەکان بە هەموو بارەکان چڕ بکەنەوە بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەکانی نەیاران و ئۆپۆسیۆنەکان لەناویاندان.

بەپێی نووسراوی (یەعقوبی)[٥٧] بڕی ئەو سەرانەیەی، کە لە سەردەمی موعاوییەدا بەسەر ناوچەکانی کوردستاندا فەرزدەکرا، بەم شێوەیەی خوارەوە بووە:

- کورەی دیجلە (١٠٠,٠٠٠) درهەم.

- نەهاوەند و ماهی کوفە (دەینور)، ماهی بەسڕە (هەمەدان) و ناوچەکانی تری خاکی چیاکە (أرض الجبل): (٤٠٠,٠٠٠) درهەم بووە.
- حەلوان: (٢٠٠,٠٠٠)درهەم بووە.
- نەینەوا (موصل) و ناوچەکانی سەر بە ئەوێ: (٤٥٠,٠٠٠)درهەم بووە.
- ئازەربایجان: (٣٠٠,٠٠٠) درهەم بووە.
- (جەزیرە): کە بریتین لە (دیارموزەڕ) و (دیار ڕەبیعە) و (دیار بەکر): (٥٥٠,٠٠٠) درهەم بووە.

دوای ئەوەی (یەعقوبی) هەواڵی کورد و کوردستانی و زێدی ئەوانی لە سەردەمی ئومەویدا پشتگوێ خستووە، چونکە لە کتێبەکەیدا بەشێکی زۆری ئەمە باس کراوە، کە پەیوەندی بە هەندێ لە بزووتنەوە و سەرهەڵدانەکانی خەواریجەکانەوە هەیە لە ناوچە جیا جیاکانی کوردستاندا، لەوانە بزووتنەوەی (شبیب) کوڕی (یزید الشیبانی) لە هەرێمی چیاکاندا ساڵی (٧٦ك/٦٩٥ز) [٥٨]دا، دیسان بزووتنەوەی (ضحاك) کوڕی (قیس الحروری) لە ساڵی (١٢٧ك/٧٤٤ز)دا لە هەرێمی جەزیرەی فوراتیدا[٥٩] دەسەڵاتدارانی ئومەوی توانیان ئەو بزووتنەوە سەر هەڵداوانە لەناو بەرن. گومانی تێدا نیە، هەرێمە کوردییەکان، لەوانە هەرێمی (جەزیرە) و (شارەزور) دەبنە پەناگەی ئەو خەواریجانەی چیایە حاشییەکان و ئەستەمەکان ئەو ناوچانە دەکەنە سەنگەری قایم بۆ بزوتنەوەکانیان لە دژی خەلافەتی ئومەویدا[٦٠]، کە لە ساڵی (١٣٢ك/٧٤٩ز) لەسەر دەستی عەبباسیەکاندا بەرەو ڕووخان چوو[٦١].

## دووەم: کورد لە سەردەمی عەبباسییەکاندا

لە چەرخی عەبباسی یەکەمدا تـا سـاڵی (٢٥١ك/٨٧٢ز) لـە ڕۆژانـی خەلیفـە (المستعين بـالله)دا، کـە (یـەعقوبی) تێیـدا وەسـتاوە لـە نووسـینەوەی مێـژووی عەبباسیدا، بە بەراورد لەگەڵ گەلانی تری خۆرهەڵاتی ئیسلامیدا، وەکـو فـارس و تورك، کورد هیچ ڕۆڵێکی کاریگەری نەبووە لە ژیانی سیاسی دەوڵەتی عەبباسی و ئەو گۆڕانکارییانەی بەخۆیەوە بینیوە.

لـەو سـات و کاتـەدا، گـەلان توانیـان سـنووری وڵاتیـان ببـەزێنن و ڕوو لـە ناوجەرگەی دەوڵەتی عەبباسی بکەن، کە خۆی لە عێراقدا دەنواند، پاشان بەشداری کرداریی و ڕاستەوخۆ بکەن لەو ڕووداوانەی لە دوو شـاری گـەورەی دەوڵـەتی ئـەو سەردەمەدا (بەغداد – سامەڕا) ڕوو دەدەن، کوردەکان دەستیان بە ژیانی تایبـەتی چیانشینی خۆیانەوە گرت، ڕاستەوخۆ بەشدارییان لە ڕووداوەکاندا نەکرد، سـەرباری نزیکی وڵاتی ئەوان لە چەقی دەوڵەتەکە، بە بەراورد لەگەڵ ئەو گەلانەدا[٦٢]، ئـەو هەڵوێستەش دەوری خۆی هەبووە، کە (یەعقوبی) هەواڵی کـورد کۆبکاتـەوە، بـە کورتی زۆرجاریش بەنێوە چڵی گێڕاویەتەوە.

(یەعقوبی) گرنگی خۆی لەسەر لایەنی ئیداری لە کوردسـتاندا، لـە سـەردەمی عەبباسیدا چڕکردۆتەوە ، ئەو والییانە لـە یـاد ناکات،کـە لەوێـدا دیـاری کـراون، پاشان ئامـاژەی کـردووە چـۆن بەرکـەنار کـراون، پاشـان ئامـاژەی بـە سیاسـەتی خەلیفەکانی عەبباسی کردووە لە ڕاست ئەو دەڤەرانەدا، عەبباسـیەکانیش گرنگـی سەرەکییان بە کوردستان داوە، چـونکە لـە ڕوانگـەی ئـابووریی و سیاسـییەوە بـۆ خەلافەت گرنگ بووە، دیـارترین نموونـەش دامەزرانـدنی والیـە بـە تواناکانـە لـە ناوچەکانی کوردسـتاندا، ڕاسـتەوخۆ هـەڵیان سـوڕاندووە، بۆیـە یەکـەم خەلیفـەی

عەبباسی (ابو العباس) (١٣٢-١٣٦ك/ ٧٤٩-٧٥٣ز) ئەبو جەعفەری مەنسوری، براکەی لەسەر زۆربەی ناوچە کوردنشینەکاندا دەکاتە والی، بە تایبەتی دەڤەری (جەزیرە) و (نەینەوا) و (ثغور) و (ئەرمینیا) و (ئازەربیجان)[٦٣].

گومانی تێدا نییە (أبو جعفر) شارەزاییەکی زۆری لەبارەی کورد و کوردستان وەردەگرێ، چونکە لەگەڵ ئەواندا دەژیێ و ژنیشیان لێ دەخوازێت، وەك (الطبري) باسی کردووە[٦٤].

دیارە (أبو جعفر المنصور) سەرەتا هەستی بە لاوازی سوڵتەی عەبباسیەکان کرد لە کوردستاندا، بە تایبەتی لە هەرێمی (ئازەربیجان)دا، لەبەر ئەوە تێبینی دەکرێ لە ماوەی دەسەڵاتیدا و لە کاتی ویلایەتی (یزید بن حاتم المهلبی الازدی)دا (مردن: ١١٧٠ك/٧٨٦ز) بۆ ئازەربیجان، ئەم والییە هەڵسا زۆرێ لە هۆزەکانی (یەمانی) لە (بەسرە)دا بۆ ئازەربیجان دەگوازێتەوە.

(یەعقوبی) بەردەوام قسە دەکات و لەم بارەوە دەڵێ: (یەکەم کەس کە ئەوانی گواستەوە (الرواد المثني الازدي) بوو بۆتە برێز[٦٥]، (مر بن علي الطائي) بۆ نریزی گواستنەوە[٦٦]، (الهمدانی) بۆ (المیابنج)ی گواستنەوە[٦٧-٦٨].

خەلیفە هارون ڕەشید (١٧٠-١٩٣ك/٧٨٦ – ٨٠٨ز) هەمان سیاسەتی لە ڕاست ناوچەکانی ئەرمینیادا بەکارهێنا، کە والیەکەی (یوسف بن راشد السلمي) کۆمەڵی (النزاریة) بۆ ئەرمینیا دەگوازێتەوە.

(زۆربەی دانیشتوانی ئەرمینیا بوونە یەمانی، نەزارییەکان لە سەردەمی یوسفدا زۆربوون)[٦٩]. بەم شێوەیە عەبباسیەکان سەرەتا سیاسەتێکی تایبەتیان لە ڕاست کوردستاندا پەیڕەو کرد، بە مەبەستی قایمکردنی ڕکێفیان بە سەریدا، دیسان عەبباسیەکان سیاسەتی لەسەر کار لابردن (العزل) و دانانی والی تریان لەگەڵ والیەکاندا بەکار دەهێنا، بۆ پاراستنی (ولاء) و دڵسۆزییان بۆ خەلافەت، وەکو

(هـارون رەشـید) کـە لـە ماوەیـەکی کەمـدا چـوار والـی لەسـەر ئـەرمینیادا دادەنێت)[٧٠].

## سێیەم: ڕۆڵی کورد لە بزووتنەوەی بەرەو ڕوبوونەوەی لە دژی دەوڵەتی عەبباسیدا

### أ – بزووتنەوەی خەواریجەکان:

پێشتر باسکرا کە لەگەڵ دەرکەوتنی خەواریجدا بۆ سەر شـانۆی ڕووداوەکـان لـە دنیای ئیسلامیدا، کوردستان بووە بە پەناگە و دالدەی ئەوان، بە درێـژایی مـاوەی حوکمی (ئومەوییەکان)، چیاکانی کوردستان دەکەنـە سـەنگەر و پەناگەیـەکی بـێ ترس بۆ سەرو ماڵیان.

لە چەرخی (عەبباسی)دا، بزووتنەوەی خـەواریج لـە نێـو کـورددا کۆتـایی پـێ نەهات، بەڵکو کەسانێ لەناو ئەواندا دەرکەوتن بۆچـوونی خەواریجـەکانیان پەسـەند بکەن[٧١].

پەیوەندی کورد بە خەواریجەوە، هەر بە بڵاوبوونەوەی مەزهـەبیان نەوەسـتا لـەو نێوەندەدا، یان بە دالدەدانی هەڵاتوانیان، بەڵکو بە کرداریـی بەشـداری زۆرێـك لـە بزووتنـەوەکانی ئـەوانیان کـرد، بەشـداری جەنگـەکانیان کـرد لـە دژی سـولتەی مەرکەزیدا.

پێویستە ئاماژە بە بایەخی (یەعقوبی) بکەین بە بزووتنەوەی خەواریجـەکان لـە ناوچـەی (جـەزیرەی فـوراتی)دا، کـە دەبێتـە مەڵبەنـدی سـەرەکی چـالاکییە

دەرەکییەکان، تـا دەگاتـە ئاسـتێك، (الهمـدانی) بـە (وڵاتـی شـوڕاتەکان) ناویـان دەبات[٧٢].

ئەمەش بۆ بێ دەسەڵاتی و لاوازی ئیدارەی دەوڵەت دەگەڕێتەوە لەو دەڤـەرەدا، دەوڵـەتی عەبباسـی هێزێکـی سـەربازی تـەواو و بـەهێزی نـەبوو، پەرچـی ئـەو بزووتنەوانە بداتەوە، کە لێرە و لەوێ کـت و پـڕ سـەریان هەڵـدەدا، زۆربـەی ئـەو بزووتنەوانە، لە سەرەتادا بزووتنەوەی تاك لایەنە و بچووك بوون ، پاشـان ورد وردە زیادیان کرد و پانتایی مەترسییان بۆ سەر دەوڵەتی عەبباسـی فـراوانتر کـرد، دوای زۆربوونی لایەنگرانیان، لاوازی ئەو دەوڵەتەیان وەکو هەلێك بـۆ خۆیـان قۆسـتەوە، دەوڵەت لە توانایدا نەبوو دوای هەوڵێکی زۆر نـەبێ، لـەناویان ببـات، یـان دایـان مرکێنێتەوە[٧٣].

جێی تێبینییە، یەکەم بزووتنەوەی خەواریجەکان، کـە (یـەعقوبی) ئامـاژەی بـۆ دەکات، بزوتنەوەی (الولید بن طریف بن الصلت بن الطارق بن سلیمان بن عمرو بن مالك الحروري الشـاري)یە لە (١٧٨ – ١٧٩ك/٧٩٤-٧٩٥ز) لە سەردەمی (هارون ڕەشید)دا.

لە گێڕانەوەیەکی ئەودا هاتووە: هارون ڕەشید سوپایەکی گەورە دەنێرێتـە سـەر جەزیرە، تا ئەو بزوتنەوانە بەر لە گەورە بوونیاندا لەناویان ببـات ، بـەڵام هـەموو ئەو هەوڵانەی شکست خواردو بوون، بزووتنەوەی خەواریجەکان فراوان بوو،کە بوو بە هەڕەشە بۆ سەر خەلافەتی عەبباسی لە ماڵی خۆیانـدا[٧٤]، لەبـەر ئـەوەی هـاڕون ڕەشید لەشکرێکی بێ سەرو بنی ناردە سـەریان، جڵـەوی سـەر لەشـکرییەکەی بـە (یزید بن فرید الشیبیانی) سپارد، برازای (معن بن زائـدە الشـیبانی) دەبێـت[٧٥]، ئەو توانی بەهۆی زیرەکی سەربازیی و ڕاوێژکردنی بە سەرکردە سـەربازییەکانیەوە،

ئەم بزووتنەوەیە لەڕەگەوە هەڵبکەنێ و(الولید بن طریف)ی سەرکردەیان بکوژێت، لەبەر ئەوە یارانی بەرەو جزیرە کشانەوە و لە (دیار رەبیعە) جێگیر بوون(٧٦).

هاوکات لەگەڵ بزووتنەوەی (ولید بن طریف) الشاری لە (جزیرە)دا، بزووتنەوەی خەواریجی تر سەریان هەڵدا، (ابو مسلم الشاری) لە (ئەرمینیا) پێوەی هەڵسا، بە تایبەتی لە شاری (بیلقان) و (برذعة). بەلام بە کۆچی دوایی سەرکردەیان، بزووتنەوەکە لە پەل و پۆ کەوت و بە ئامانجەکانی نەگەیشت(٧٧).

بەپێی گێڕانەوەی ((یەعقوبی)) لە سەردەمی خەلافەتی (الواثق)دا (٢٢٧-٢٣٧ك/ ٨٤١- ٨٤٦ز)، (محمد بن عمرو الشاری) بە بزووتنەوەیەکی تر هەڵسا لە (دیار ربیعە)دا، (٣٠٠-٤٠٠) کەسی شوێنکەوتە بوو لە عەرەب و کورددا(٧٨).

(محمد) و یاوەرانی بەرەو (شەنگال- سنجار) ڕۆیشتن، دوایی بەرەو نەینەوا (موسڵ) کەوتنەڕێ، دوای ئەوەی بە دەستی هێزەکانی خەلافەتی عەبباسی شکستیان هێنا، دوایی بە دیل گیراو لە ڕۆژێکی گرنگدا بەرەو (نصیبین) گواسترایەوە، زۆری پێ نەچوو دوای بە دیل گیران بەرەو خەلیفە (الواثق) برا، بەو هۆکارە کۆتایی بە بزووتنەوەکەی هات، کە زۆر لەمێژ بوو شانی خەلافەتی عەبباسی قوڕس کردبوو(٧٩).

شایەد بەهێزترین بزووتنەوەی خەواریجەکان، ئەو بزوتنەوە بوو، کە(مساور بن عبدالله الحمید الشاری) (٢٥٢ -٢٨٣ك/٨٦٦ – ٨٩٦ز) دایمەزراند، کە دەتوانرێ بە گەورەترین بزووتنەوەی خەواریج دابنرێ،کە نەینەوا (موسڵ) و جەزیرەی فورات لە سەدەی (٣ك/٩ز) بە خۆیەوە ببینێت، تەمەنێکی هەرە درێژی هەبوو، پەل و پۆیەکی فراوانی هاویشتبوو، لەهەموویان زیاتر چالاکانە زیانی بە دەوڵەتی عەبباسی گەیاندو، خەریك بوو ببێتە مەترسییەکی ڕاستەقینە بۆ سەری(٨٠).

لێکۆڵەران لە ڕاست بنەمای (مساور) دا ناکۆکن، هەندێ لەوانە بە تایبەتی لێکۆڵەرانی کورد پێیان وایە: (مساور) بە ڕەچەڵەك کوردە[81]، بەڵام (یەعقوبی) بە شێوەی یەکلاکراوە دەڵێ: سەر بە (بنی شیبان)ە[82].

ڕەنگە هەڵەی مێژوونوسانی کورد لەمەدا لەبەر ئەوەی بووبێ، کە زۆربەی پەیڕەوی (مساور) کورد بوون، زۆربەی ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی (مساور)دا بوون، ناوچە کوردنشینەکان بوون[83].

(یەعقوبی) دەڵێ: (مساور) توانی لە پایتەخی (سامەرا)دا، خۆی بخزێنێتە ناو کۆشکی خەلافەتی عەبباسی ، لەبەر ئەوە (موعتەز سەرکردە و سوپایەکی تر هەڵدەبژێرێ، دوای سەرکردە و سوپایەکەی تر، ئەو تێکیان دەشکێنێ، تا دەگاتە ئاستی خەڵکی پتر بە هێزتر دەبێت)[84].

(یەعقوبی) ئاماژەی بە کۆتایی ئەم بزووتنەوەیە نەکردووە، کە لە ساڵی (٢٨٣ك/ ٨٩٦ز) کۆتایی پێ دێت.

## چوارەم: بزووتنەوەی کورد لە سەردەمی عەبباسیدا

کورد تەنیا بە بەشداری کردنی لەگەڵ بزووتنەوەی خەواریجەکان ڕانەوەستا، بەڵکو خۆیشیان لە وڵاتی خۆیاندا، دژ بە دەوڵەت بە چەند بزووتنەوەیەکی بەرهەڵستکارانە هەڵسان ، هەوڵیاندا لە ڕکێفی ڕاستەوخۆی دەوڵەتی عەبباسی بڕۆنە دەرەوە، لەگەڵ دان هێنان بە خەلیفەی عەبباسی، سەربەخۆیی زیاتر بۆ خۆیان بەدەست بێنن.

دیارترین نموونەمان بۆ ئەو ڕاستییە، ڕووداوی بزووتنەوەی (خوڕەمی) یە (٨٥٩) بوو، یان (مەحمەرە)، کە (بابکی خورەمی) (٢٠١-٢٢٣ك /٨١٦-٨٣٧ز)

سەر لەشکریی کرد، ئەو بزووتنەوەیە گەورەترین کاردانەوە بوو، دژی ستەم و چەوساندنەوەکان، بەشداران خراپیی و بێزاریی خۆیان دژ بە سیاسەتی میرەکان و والییەکانی عەبباسییەکان تێدا گوزارشت کرد، سەرباری ئاراستەی ئاینی و سیاسییان، بزووتنەوەکە ئاینیی و سیاسیی بوو، لە بزووتنەوەکانی ترلە دەسەلات و تەشەنەکردندا جیاواز بوو، سەرباری لێهاتوویی سەرلەشکرەکەی و، یەکڕیزیی نەخشەی سیاسیی و سەربازیی لێزانانەی[٨٦].

کورد لە ڕیزی پیشەوەی گەلانی تر، بە قورسایی خۆیان بەشداری ئەم بزووتنەوەیە دەکات، ئەم بەشدارییە لە گشتگیرییەوە نزیک دەبێت[٨٧].

(یەعقوبی) لە کتێبی(البلدان)دا، کاتێ باسی (رستاق القامدان) دەکات لە (اصفهان)، باسی ئەوەش دەکات،کە کوردی تێدا بووە لەگەڵ عەجەمدا و، (الخرمیە)ی لێوە سەرهەڵدەدات[٨٨].

دەرکەوتنی (خەرەمییە)، وەك (یەعقوبی) باسی کردووە بۆ ساڵی (١٩٢ك/٨٠٧ز) دەگەڕێتەوە، لەم ساڵەدا، خەرەمییە لە (ارض الجبل) دەردەچن، ئەمە یەکەم دەرچوونە، خەلیفە (ئەمین) عبداللە بن مالك (الخزاعی) وەکو سەرلەشکر ڕەوانە دەکاتە سەریان، (قەسابخانەیەکی گەورەیان لێ دروست دەکات، ئەوانەی دەمێننەوە بە وڵاتاندا ئاوارە دەبن)[٨٩].

لە سەردەمی مەئمون دا (١٩٨-٢١٨ك/ ٨١٣ -٨٣٣) بزووتنەوەکە کەڵەکە دەبێ، (خورەمییە) بە سەرکردایەتی (بابکی خوڕەمی) بەڕاست و چەپدا دەست بە جوڵە دەکات.

(یەعقوبی) بە درێژیی باس لەو شەڕە لە سەردەمی مەئموندا دەکات ،کە سوپای خەلافەت لەگەڵ (بابکی خوڕەمی)دا ئەنجامی دەدات، بە زۆری

سەرکەوتنەکان لە قازانجی بابکدا دەبێ، تا والی خەلیفە (محمد بن عبدالحمید الطوسی) ساڵی (٢١٤ك/٨٢٩ز) دەکوژێت[٩٠].

دوای گەورە بوونی ڕۆڵی ئەو بزووتنەوەیە و کاریگەریی پەیداکردنی بۆ سەر خۆرهەڵاتی ئیسلامی، خەڵکەکی زۆر پەیوەندی پێوە کردن، (مەئمون) ماوەیەکی زۆر بیری لەوان کردەوە، دوای ئەوە پلانێکی بۆ بەرەو ڕووبوونەوەی خورەمییە دۆزییەوە، ئەم بابەتەی بە (عبدالله بن طاهر) سپارد، کە شەڕیان لەگەڵدا بکات(کورە الجبل) و (ئەرمینیا) و (ئازەربیجان) ی پێ سپارد، واتە: زۆربەی ناوچە کوردنشینەکان، ، (ابن) لە (دەینور)دا دانیشت، بە مەبەستی بەرگری کردن لە بزووتنەوەکەیان، زۆربەی هەوڵەکانی مەئمون شکستیان خوارد، وردە وردە بزووتنەوەی خورەمییە، تا دەهات فراوانتر دەبوو، تا (المعتصم) هاتە سەر کورسی لە ساڵی (٢١٨ – ٢٢٧ك/ ٨٣٣ – ٨٤١ز)، کە جگە لە نەرم کێشی لەگەڵ بەرهەڵستکارانیدا، هیچ ڕێگایەکی نەدۆزییەوە[٩١].

جەنگی خورەمییەی خستە ڕیزی پێشەوەی کارەکانی، چونکە جەنگی بابك لە قۆناغی ترسناکی دابوو، لەگەڵ دەست پێکردنی حوکمی موعتەسەمدا، خورەمییە لە هەرێمی چیا (اقلیم الجبال)دا دەستی بە جوڵان کرد، (یەعقوبی) لەو بارەوە باسی کردووە: (المحمدە) لە چیاکە (الجبل) دەرچوون، ڕێگاکانیان گرتن و مەترسییان خستە ڕێگاو بانەکانەوەو، چونە پێش حاجیانی خوراسان، ئەوانیان شکاندو کۆمەڵێکیان لێیان کوشت)[٩٢].

لە ئەنجامی ئەو بارە ناهەموارەی (اقلیم الجبل)، خەلیفە موعتەصەم خۆی خستە ناو گەرمەی جەنگەوە لە دژی ئەو خورەمیانەی لە (همذان )[٩٣] گردبوو بوونەوە، خەلیفە ڕکێفی سەرلەشکری سپارد بە (اسحاق بن ابراهیم)، سوپای خەلافەت و خورەمییە، چەند جەنگێکیان لە نێواندا قەوما، (اسحاق بن ابراهیم)

توانی شکست بە (خورەمییە) بێنێ، دوای ئەوەی یەدەگی هێرشیی و بەرگریی بە ئاگادارییەوە بەکار هێنا (قەسابخانەیەکی گەورەی لێ داخستن، دەوامی کرد تا وڵات هاتەوە باری ئاسایی خۆی، دوای ئەوەی بە دەستی ئەوان تووشی زیان هاتبوو)[٩٤].

جێگای تێبینیە، کە دەسەڵاتی (بابك) بەتایبەتی کاتێ زیادی کرد، یەکێ لە میرانی کورد، لە ئازەربیجان دەڕواتە ژێر گوێڕایەڵی ئەوەوە، بەناوی میر (عیسمەتی کوردی) شاری مرند[٩٥].

دیسان میرەکی تر لە ئازەربیجان دێتە ژێر باری ئەو، کە لە ڕەگەزی عەرەب دەبێ، بەناوی (محمد بن البعیث)، لە دەریاچەی (ئورمییە) دوو قەڵای دەبێت، بابك دڵی بەرەو لای ڕادەکێشێ و خۆی هاوپەیمانی لەگەڵدا دروست دەکات، خەلیفە بیری کردەوە چۆن ئەو هاوپەیمانیتیەیان تێك بدات، ئەوە بوو بە پەلە هێزی خۆی ڕەوانە کرد، تاوەکو زەبرەکی دەستپێشخەر بە دوژمن بگەیێنێت، جا سەرلەشکریی دایە دەست (طاهر بن ابراهیم)، هەرکە (ابن البعیث) هەواڵی سوپای موعتەصەمی زانی، کە بەرەو بارەگای ئەو و بابك دێن، دەستی لە (بابك الخرمی) هەڵگرت، نامەیەکی بۆ خەلیفە نارد، داوای سۆز نواندنی لێکرد، پەیمانی دڵسۆزیی و گوێڕایەڵیی دایە، دیسان پەیمانی دایە،کە ئامادەیە شەڕ لەگەڵ بابکدا بکات، ئەوەبوو دەوری خۆی دەرخست و فێڵی لە (عیسمەتی کوردی) کرد و تەڵەی بۆ نایەوە،کە کچی ئەوی خواستبوو، بانگێشتی ماڵی خۆی دەکات، پاشان دەیگرێ و لە سامەڕا، ڕادەستی موعتەسەمی دەکات ، ئەم کارە قیزەونە، زەبرەکی کوشندە بوو لە دژی بزووتنەوەی بابك، خەلیفە توانی بە پاڵپشتی تورکەکان لە ساڵی (٢٢٣ك/٨٣٧ز)دا کۆتایی بەم بزووتنەوەیە بێنێ، دوای ئەوەی بابك دەگرێ و لەلایەن موعتەسەمەوە لە سامەڕا لە سێدارە دەدرێت[٩٦].

(افشین حیدر بن کاوس الاوسروشنی)ی ڕەوانە کردو هەموو پێداویستییەکی بۆ سەرکرد و سامان و کۆگای چەکی لەگەڵدا نارد، کاتێ (افشین) گەیشتە (الجبل) هەرچی دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵات هەبوون گرتنی، چەند شەڕێکی لەگەڵ بابکدا ئەنجامدا، سەربازگەکەی لەشوێنێ بوو، بە ناوی (برزند)، لە (٩/رەمەزان/٢٢٢ك/٨٣٦ز)دا (بابك) پەیامنێری خۆی ناردە لای، داوای لێ کردبوو دانوستاندنی لەگەڵدا بکات، ئەویش ڕازی دەبێت، ڕووبارێکیان لە نێواندا دەبێ، (افشین) ئەمانی خستنەڕوو، داوای لێکرد ئەو ڕۆژە دوای بخات، پێی گوت: (تۆ دەتەوێ شارت قایم بکەی، گەر ئەمانەت دەوێ دۆڵەکە ببڕە، ئەنجا ڕۆیشت و شەڕ گەرم بوو، موسڵمانان (البذ) یان گرت، بابك و شەش لە یارانی ڕایانکرد، موسڵمانان، دیلە موسڵمانەکانیان رزگار کرد لە (البذ)دا، کە (٧٦٠٠) کەس دەبوون)[٩٧].

لەگەڵ لەسەر ڕۆیشتنی قسەکاندا، (یەعقوبی) زیاتر گرنگی بە بزووتنەوەکانی کورد لە هەرێمی (ئەرمینیا) داوە، ڕەنگە لەبەر ئەوەی بێ، وەکو باسمان کرد ماوەیەکی زۆر لەوێ مابێتەوە.

(یەعقوبی) بایەخی زۆری بەم هەرێمە داوە، کە دەکەوێتە ئەوسەری باکوری خاکی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، هەرێمەکە بەشی باکوری خۆرهەڵاتی کوردستانی گرتۆتەوە، کە بە گۆشەی باشوری خۆرئاوای ئەرمینیا و ناوچەکانی دەوری دەریاچەی (وان) خۆی دەنوێنێت[٩٨]، کورد مێژوویەکی درێژی مێژوویی لەگەڵ ئەو دەڤەرەدا هەیە، دەڕواتە چاخە کۆنەکانەوە[٩٩]، بە تایبەتی شاری (ارزن)(١٠٠) و (بەدلیس)(١٠١) و (وان) و ناوچەکانی تر، کە بەشێك لە کوردستانی ئێستای تورکیا پێك دێنن.

بەڵام ئەو ناوچانەی دەسەڵاتدارانی عەبباس حوكمیان كردووە، ڕووبەرێكی فراوانی جوگرافییان هەیە، ئەستەمە هەموو ڕووداوەكانی ناویان، هەڵوێستەیان لەسەر بكرێ، كە لەم بوارەدا هەوڵیان نەداوە.

(یەعقوبی) ئاماژەی بە بزووتنەوە بەرهەڵستكارەكانی دژ بە دەوڵەتی كردووە، نەخوازەلا كورد لە دژی دەوڵەتدا، لە حوكمی هارون ڕەشیددا، سەرباری ئەنجامدانی چاودێری ئاسایشیی و سەربازیی، دانیشتوانی ناوچەی ئەرمینیا ڕادەپەڕن، خەڵكی شاری (برذعة) لە پێش هەموویانەوە، هەڵیان كوتایە سەر والی شار و كوشتیان، هارون ڕەشید هەموو هەوڵی خۆی چڕكردەوە ئەو ڕاپەڕینە لەناو ببات، ئەمەش بە گۆڕینی والیەكان و دانانی ئەو والییانەی جێی متمانەی ئەو بوو، تا ئەمیندار و ئاڵقە لەگوێی ئەو بن لە پاراستنی ئاسایشدا و، خەڵكی ئەرمینیا بێنە ژێر ڕكێفی فەرمانەكانی ئەوو سیاسەتەكانی، ئامرازەكانی گوێ لەمشتی بە تەواوی لە دەستی ئەودا بێت، لەبەر ئەوە خەلیفەكان هەوڵیان داوە ئەو پیاوانە بە والی لەو شوێنانە دابنێن،كە بە توانا بن، بە مەبەستی پاراستنی ئاسایش، لەگەڵ دانانی چاودێری ورد و سیخوڕیی لەلایەن سیخوڕە تایبەتییەكانیانەوە، تا ئەوەی ڕوویداوە لە شلەژان و ئاژاوەكان دووبارە نەبنەوە و جلەوی ئاسایش بگیرێ، بەڵام خەلیفە نەیتوانی بە تەواوی دەسەڵاتی تەواوی بەسەر ئەو ناوچەیەدا بسەپێنێت(١٠١).

لەگەڵ هەوڵی چەند جارەی پشێوی ، نائارامی درێژەی كێشا، كارەكان لە دەست ئەو چوونە دەرەوە، نموونە ڕووداوی (٢٢٧ك/٨٤١ز)یە لە سەردەمی (الواثق)دا، كە سەرلەنوێ خەڵكی ئەرمینیا دەستیان بە ڕاپەڕین كردەوە، پادشایانی چیاكان (الجبال) وكورد لەو ناوچە دیارانە زاڵبوون و، دەسەڵاتی خەلافەت لەناویاندا لاواز بوو، ئەوەی دواییان هەوڵیدا دەسەڵاتی خۆی قایم بكات لەسەریان، دوای ئەوەی یەكێ لە والیە بەهێزەكان بەكاردێنێ بەناوی (محمد بن خالد)، كە هەوڵی زۆر

دەدات بە توند و تیژی لەگەڵ ناوچەکەدا، بەلێدان و زیندانی کردن و ئاگردانی ماڵ وحاڵیان، تاوەکو دەسەڵات پەیدا بکات، وەك (یەعقوبی) باسی کردووە(١٠٤).

سەربوردە مێژووییەکان باس لە بزوتنەوەی کاربەدەستانی ئەرمینیا دەکەن، بە تایبەتی دانیشتوانی (ارزن) و (بدلیس) لە حوکمی (المتوکل) دا، کە لە ((٢٤٧ك/٨٦١ز) دا کۆچی دوایی دەکات (١٠٥).

پاش ئەوەی یاخی بوونی خۆیان لە ڕاست خەلافەتدا ئاشکرا کرد، بەڵام سەرکردەی عەبباسی (بغا)ی گەورەی بە ڕەگەز تورکی، دوای شەڕێکی گەورەی لە (ارزن) دا، توانی ئەو بزووتنەوانە لەناو ببات، (موسا بن زرارە) کە لە (بدلیس)دا دۆڕا، هات داوای ئەمان و گیان پاراستنی لێکرد، ئەویش کۆت و بەندی کرد و ڕاپێچی لای (المتوکل)ی کرد، دوایی بۆ (الباق) ڕۆیشت، (اشوط بن حمزة)ی لێ بوو، ئابلۆقەیدا و ئەمانی دایێ، پاشان بەرەو سامەڕای برد، لەسەر دەروازەی گشتیی لە ملی داو بە هەڵیواسی(١٠٦).

ئەمەش مانای وانیە دانیشتوانی کوردستان هەمیشە لە دژی خەلافەتدا وەستاونەوە، بە تایبەتی ناوچەی (ثغرية)، کە هەمیشە (ڕۆم) و (ئەرمەن) و (ئەرەج)(١٠٧) پەلاماری ئەوانیان داوە، لەبەر ئەوە لە کاتی پەلاماری ئەواندا شان بە شانی خەلافەت بە مەبەستی بەرگری لە نیشتمان لە دژی ئەواندا جەنگاون، نموونەی ئەوە لە سەردەمی خەلیفە (المستعين)دا (٢٤٨-٢٥٢ك/٨٦٢-٨٦٦ز)دابوو.

ئەو (علی بن یحیی بن الارمنی) ساڵی (٢٤٨ك/٨٦٢ز) کردە سەرکردە، ڕۆمەکان هێرشیان هێنا، ناوەندی وڵاتی موسڵمانانی گرت، کۆمەڵێ خەڵکی ئەو شارە چوونە لای فەرماندە (علی بن یحیی) پەیمانێکیان لەگەڵدا ساز کرد، لە ڕاست

شەڕکردن لەگەڵ ڕۆمدا کە (لەگەڵیاندا ڕۆیشت، توشی سەربازی ڕۆم بوو، شـەڕێکی سەختی لەگەڵدا کردن، لە ئەنجامدا کوژرا و ڕۆمەکان لاشەکەیان برد، ئـەوەیان بـە سەرکەوتنێکی گەورە دانا، چونکە ئەوانیان شپرزە تێخست)(١٠٨).

بەو شێوەیە دەبینین خەڵکی ئەرمینیا باشترین بەرگرییان لـە وڵاتیـان کـردووە، پاڵپشتی خەلیفەی عەبباسییان کـردووە لـە دژی ڕۆمـدا و هاوپـەیمانییان لەگەڵـدا بەستووە.

## پوختە و سەرەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە

یەکەم: (یەعقوبی) زانیارییەکی تەواو لە بارەی کورد و کوردستان پێش ئیسـلام نادات بە دەسـتەوە، ئـەوەی لـە بـارەی کـوردەوە باسـی کـردووە دەگەڕێتـەوە بـۆ سەردەمی حوکمی (ئەردەشێری کوڕی بابك)، دامەزرێنـەری دەوڵـەتی (ساسـانی)، باسـی کردووە،کـە کوردسـتان دەکەوێتـە نێـوان ئیمپراتۆریـەتی ساسـانی و ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانییەوە.

دووەم: (یەعقوبی) سەر بەپێڕەوی ئیمام عەلی بوو(کرم الله وجهه)، قوڵ بۆتـەوە لە گرنگی دان بە ئیمامەکان، (أمیر المؤمنین) تـەنیا بـۆ ئیمـامی عـەلی و ئیمـام حەسەن بەکاردێنێ (سەلامیان لێبێ) لەناو خەلیفـەکانی ڕاشـدین (ڕەزای خوایـان لێبێ) و خەلیفەکانی ئومەویی و عەباسیدا.

سێیەم: دوای ئەوەی موسڵمانان چەندان وڵات دەگرن، هیچ زانیارییەك دەربارەی کورد نادات تەنیا هەندێك ئاماژە بەو والییانە دەکات لە ناوچەکانی کوردسـتانداو دەستنیشانیان دەکات.

چوارەم: (یەعقوبی) لە چەرخی ئومەویدا ئاماژە بە بزووتنەوەی (شبیب بن یزید الشیباني) لە هەرێمی (الجبل) ساڵی (٧٦ك/٦٩٥ز) و بزوتنەوەی (ضحاك بن قیس الحروري) ساڵی (١٢٧ك/ ٧٤٤ز) دەکات لە جەزیرەی فوراتدا، ئەو دوو هەرێمە دەبنە پەناگەی خەواریجەکان و مەڵبەندی بزووتنەوەکانیان لە خەلافەتی ئومەویدا و باسکردنی کورد پشت گوێ دەخات.

پێنجەم: (یەعقوبی) گوێ بە دەوری کورد نادات لە چەرخی عەبباسیدا، تا دەگاتە ساڵی (٢٥١ك/ ٧٨٢ز)، بە بەراورد لەگەڵ باسکردنی میللەتانی تری، وەکو فارس و تورك، ئەم هەڵوێستە لە کاتی نوسینەوەی هەواڵی کورددا، چەند سەرە پەنجەیەکی سەلبی پەیدا کرد، کە کورتی بکێشێ ، زۆربەی جاریش ناتەواوو نیوەچڵ بێت، نموونە: بزووتنەوەی (ولید) کوڕی (طریف الشاري)یە (١٧٨ – ١٨٩ك/ ٧٩٤-٧٩٥ز) لە حوکمی هارون ڕەشیددا، دیسان بزووتنەوەی (بابك الخرمي) لە (٢٠٠-٢٢٣/ ٨١٦ – ٨٣٧ز)، کە بە دەرکەوتوترین و ترسناکترین بزووتنەوە دادەنرێ لە دژی خەلافەتی عەبباسیدا، کورد لەو بزوتنەوەیەدا بێزاری خۆیان گوزارش دەکەن لەو توندوتیژی و ستەمەی سەرکردە و والییەکانی عەبباسیەکان ئەنجامیان داوە لەکوردستاندا.

شەشەم: ئەو سەرچاوانەی لەبەر دەستماندایە، زانیاری تەواو یەکلاکراوانەمان پێ نادەن لە بارەی مێژوی مردنی (یەعقوبی)، هەرچەندە زۆربەی سەرچاوەکان بۆ ئەوە دەچن مردنی (یەعقوبی) ساڵی (٢٨٤ك/ ٨٩٣ز) بووە، بەڵام ئاماژەیەك هەیە لەمێژووەکەیدا مردنی بۆ دوای ساڵی (٢٩٢ك/ ٩٠٥ز) دەگەڕێتەوە. دەڵێ:

(شەوی جەژنی ڕەمەزانم لە یادە لە ساڵی (٢٩٢ك) دا، لە یادمە (ابن طولون) لە جێدابوو لەم شەوەدا، لەناو جل و بەرگ و دروشمی ڕەنگا و ڕەنگ و بەرگی گرانبەهادا بوو، لەناو دەنگی تەپڵ و زوڕنای تیژدا بوو، ئەو کاتە فکرەیەکم بۆ

هات و دایگرتم، ئەو شەوە خەوتم، گوێم لە دەنگێ بوو بەئیلهام هاواری دەکرد لە خەونمدا (گەر (ابن طولون) ڕۆیشت، مولْك و جوانیش دەڕوات)(١٠٩).

وەك ئاشكرایە ڕوخانی دەوڵەتی (الطولونیة) لە ساڵی (٢٩٢ك) دا ڕوودەدات، ئەمەش بەڵگەیەكی نوێیە ئەو بڕوایەمان بۆ پەیدا دەكات،كە وەفاتی ئەو لە دەوروبەری (٢٩٢ك/ ٩٠٥ز) دا دەبێت(١١٠).

**پەراوێزەکان:**

١- یاقوت الحموي، معجم الأدباء، ج٥، ل: ١٥٣-١٥٤.

٢- ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٢، ل ٤٠.

٣- کراتشوفسکی، تأريخ الأدب الجغرافي عند المسلمين، ج١، ل ١٥٣.

٤-ئەرمینیا: ولاتێکە دەکەوێتە (برذعة) وە تا دەروازەی دەروازەکان لەلایەکی ترەوە بۆ ولاتی ڕۆم چیای (القبق) و (صاحب السرير) لە هەرێمی پێنجەمدا. (ياقوت الحموي، معجم البلدان، مج١، ل ١٣٢-١٣٣.

٥- (الطاهر)یەکان: ئیماراتیان لە خۆراسان و ناوچەی تری خۆرهەلاتی ئیسلامیدا دامەزراند، بە سەرکردایەتی (طاهر بن الحسن)دا، لە خەلافەتی (المأمون)دا سالی (٢٥٠ك/٨٢٠ز)دا، تا سالی (٢٥٩ك/ ٨٧٢ز) حوکمیان بەردەوام بوو، سەیری (ميسون هاشم مجيد، الخلافة العباسية بدويلات المشرق في قرن الثالث الهجري وحتى نهاية القرن الخامس الهجري، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الآداب، جامعة الموصل، ١٩٨٣) بکە.

٦- معجم الأدباء، ج٥، ل ١٥٤.

٧-ياسين ابراهيم الجعفری، اليعقوبی المورخ والجغرافی، ل٢٤

٨-اليعقوبی، مشاكلة الناس لزمانهم، ص. ٣٥

٩- کراتشوفسکی، سەرچاوەی رابردوو، ج١، ل: ١٥٨

١٠- اليعقوبی، البلدان، ل.٣

١١- الطبري، تأريخ الطبري، ج١٠، ل.٧٩

١٢-اليعقوبی، تأريخ اليعقوبی، ج٢، ل١٢٢-١٢٤.

١٣-هەمان سەرچاوە، ج٢، ل١٢٣-١٢٤.

١٤-ياسين ابراهيم الجغفری، سەرچاوەی ڕابردوو، ل:.٤٠

١٥-معجم الادباء ل: ١٥٣-١٥٤.

١٦-فرانس روزنتال، علم التأريخ عن المسلمين، ل١٨٦-١٨٤.

١٧-سيد عبدالعزيز سالم، التأريخ العربی والمورخون، ل.٩٩

١٨-اليعقوبی: تأريخ اليعقوبی، ج٢، ل.٢

١٩-دراسات عن مورخين العرب، ل.١٣٩

٢٠- عبدالعزيز الدوري (بحث في نشأة علم التأريخ عند العرب، ل.٣٤

٢١-روزنتال، سەرچاوەی ڕابردوو، ل.١٢٥

٢٢- مرجليوث، دراسات عن المؤرخين العرب، ل١٣٩.

٢٣-سەرچاوەی ڕابردوو، ل.١٣٩

٢٤-عبدالعزيز الدوری، سەرچاوەی رابردوو، ل٥٢-٥٣.

٢٥-البلدان، ل٧-.١٠

٢٦-هەمان سەرچاوە، ل٧-.١٠

٢٧-(ئەردەشێر)ی كوڕی (بابك) كوڕی (ساسان)ی (ئەسفەر) كوڕی (خك) كوڕی (مهرس) كوڕی ساسانی گەورە، كوڕی (بەهمەن) كوڕی (ئەسفنديار) كوڕی (بشتايق)، پادشايەكی ساسانی يە بەسەر دوا سەرلەشكری دوا پادشای (ئەرشاقيەكان)دا (لطبان)ی پێنجەمدا لە شاری (ئەهواز) دا لە ساڵی (٢٢٤/٢٢٦) دا سەركەوت.

(ابو حنيفة الدينوري، الأخبار الطوال، ل٨٤. (كريستن، ايران في عهد ساسانيين، ت: يحيى الخشاب، بيروت ١٩٨٢م، ل٤٨٦.

(سامي سعيد الاحمد) و (رضا جواد الهاشمي): (تأريخ الشرق الأدنى القديم ايران واناضول، وزارة التعليم العالي والبحث العلمي، بغداد، د.ت، ل.١٥٢

٢٨-اليعقوبی، تاريخ اليعقوبی، ج٢، ل .١٥٨

٢٩-وڵاتی جەزيرەی فوراتی: دەكەوێتە نێوان ديجلە و فوراتەوە، لە بەرزاييەكانی عێراق و دەوروبەری وڵاتی شام، سەيری (ابن عبدالحق، مراصد الإطلاع، ج١، ل٢٥٨)بكە. (سوادي عبدمحمد، الأحوال الإجتماعية والإقتصادية في بلاد الجزيرة الفراتية، ل٣٣-٣٨

٣٠- اذربيجان: (ئاذر) بە پەهلەوی ئاگرە، (بايجان) واتە: خەزنەدار، بە مانای خانەی ئاگر يان دەرگەوانی ئاگرێت.

ئازەربيجان بە بەشێك لە (برذعة) دادەنرێ لەخۆرهەڵاتدا دەگاتە خۆرئاوای (ئاوزنجان) سنووری دەگاتە باكوری وڵاتی (ديلم) و (الجبل) و (الطرم). شارە ناودارەكانی وەكو: (تبريز) و (مراغە) و (سەڵماس) (مورمييە) و (ئەردەبيل) و (خوی) و (مرند) ....هتد. (ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٠٩).

هەروابڕوانە (حسام الدين علي غالب، اذربيجان ٤٢٠-٦٥٤ك، ١٠٢٩-١٢٥٦ز، دراسة في احوالها السياسية والحضارية) نامەی دکتۆرا، بڵاونەکراوەتەوە پێشکەش، (كلية الآداب، جامعة بغداد) کراوە (بغداد/ ١٩٨٤)، ل٣٤-٣٧. (احمد عبدالعزيز محمود، الإمارة الهذبانية الكردية في اذربيجان واربيل والجزيرة الفراتية من (٢٩٣-٦٥٦هـ، ٩٠٥-١٢٥٨م)(ل٣٣-٣٦).

٣١-اليعقوبی، تأريخ، ج٢، ل.١٥٩

٣٢-هەمان سەرچاوە، ج٢، ل١٦٧-.١٦٨

٣٣-هەمان سەرچاوە، ج٢، ل.١٥٧

٣٤-(الرها) شارێکە لە جەزیرە لە نێوان نەینەواو شامدایە، (یاقوت، البلدان، مج ع، ل.٤٥٠

٣٥-(حەران) شارێکی ناوداره دەکەوێتە دەڤەری جەزیرە، تا باکوری شاری (الرها)، لەسەر ڕێگای نەینەوا و شام و ڕۆم، (یاقوت، البلدان، مج ٣، ل١٣٠). (ابو الفداد: تقويم البلدان، ل٣٧٧).

٣٦-اليعقوبی، تأريخ اليعقوبی، ج٢، ل.١٥٧

٣٧-(كور الاهواز) جنديسابوره، (سوس) شووشه، (تستر) بريتييه (ششتر، ايذج)، هەمان سەرچاوە، ج٢، ل١٧١-.١٧٧

٣٨-جەلەولا: شارێکە دەکەوێتە پارێزگای دیالە، نێوان ئەوێ و دیالە (٧) فەرسەخە (٤٢كم)، تا ئێستا نیوەی دانیشتوانی کوردە، یەکێ لە ناوچەکانی ئەو کورە (پارێزگا)یە (استان قباذ)ە دەڤەری (السواد). پێنج گوندی بەسەرەوەیە، (٧) فەرسەخ (٤٢كم) لە خانەقینەوە دوورە، لەسەر ڕێگای خوراسانە. (یاقوت الحموی، البلدان، مج٣، ل٧٠-٧١. (ابو الفداء، تقويم، ل٣٠٤، بۆ زانستی تر بڕوانە (حکیم احمد خۆشناو، الكورد وبلادهم عند البلدانيين والرحاله المسلمين، ل١٨١).

٣٩-اليعقوبی، تأريخ اليعقوبی، ج٢، ل٩٥. (ابن الأثير، الكامل في التأريخ، ج٣، ل٧٩).

٤٠-یەزگورد کوڕی شەهریار کوڕی کیسرای کوڕی پەروێز: یەزگوردی سێیەمە، دوا پادشای ساسانییە، ساڵی(٣١ك، ٦٥٢ز) لە دەسەڵاتی عوسمانی کوڕی عەففاندا دەکوژرێ، میرێکە لە نەژادی شاکیسرای پەروێز، لەبەرامبەر پەلاماری موسڵماندا لە

شەڕی قادسیە و مەدائیندا، سوپاکەی شکستی هێنا لە (١٦ك/ ٦٣٧ز)دا ڕادەکات لە شاری (مرو) لەناو دەچێ و ئیمپراتۆری ساسانی دادەڕمێت.
(ابن سعد، طبقات، ج ، ل١٨٧). (الدینوري، الأخبار الطوال، ل١١٤-١٣٣). (الیعقوبي، تأریخ، ج١، ل١٥١).
(الطـبري، تـأریخ، ج٤، ل١٨٠). (ابـن خلكـان، وفیـات الأعیـان، ج٤، ل٥٩). (ئارتـەر كریستین، ایران في عهد ساسانیین، ت: یحیی الخشاب، بیروت، ١٩٨٢ز، ل٤٨٦-.٤٨٩
٤١-نەهاوەند: شارێكی نـاودارە (٨٤كـم) لـە هەمـەدان دوورە، (یـەعقوبی) لـە كتـێبی (البلدان)دا، ل٨٤). (الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٨). (یاقوت: البلدان، مج٨، ل٤٠٩).
٤٣- هەرێمی (الجبال): مەبەست لە هەرێمی چیا (اقلیم الجبـال: ناوچـەكانی ناوەڕاسـت و باكورە لە چیای زاگرۆسی ئێستادا، زۆربەی دانیشتوانی كوردە، (الاصطخري: المسـالك و الممالك، ل٥٨).
الیعقوبی، البلدان، ل٣٩. (ابن رستە: الاعلاق النفیسە، ل١٥٠. الادریسی: نزهە المشتاق، ل.٢٢٣
٤٣-(ئەهواز) كورەیێكە یان پارێزگایێك بە تەواوی، هەرچی وشەی شار (البلد)ە، كـە بـە زۆری بۆ بەكاردێ لای خەڵكی مەبەست لە (بازاڕی ئەهوازە)، بەڵام هەرێمی (الاقلـیم) ئەهواز لە (٧)كورە (پارێزگا) پێك دێ، دەكەوێتە نێوان بەسرە و فارس، هـەر كورەیـە ناوی خۆی هەیە، (یاقوت، البلدان، مج١، ل٢٢٦-٢٢٧).
٤٤-( عیاض) كوڕی (غنم الفهري): یەكێكە لەوانەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ی بینیووە، بەر لە كۆچكردن بە (٤٠)ساڵ پەیـدا بـووە (٨٣٥ز)، بـەر لـە (حودەیبیـە) موسڵمان دەبێ، لە گرتنی شام و عێراق بەشدار دەبێ، شاعیرێكی باش و سەخی بووە، لە ساڵی (٢٠ك/ ٦٤٠ز) مردووە لە شامدا، دوای ئـەوەی (٦٠)سـاڵە دەبرێـت. (ابـن سعد/ الطبقات الكبری، ج٧، ل.٣٩٨
٤٥-(الرقة): شارێكی ناودارە، دەكەوێتە سەر كەناری فورات، بەشی خۆرئاوا لە سـوریادا، بەرلە تێكەڵ بوونی ڕووباری (بلیخ) بە ڕووباری (فـورات). (یـاقوت/ البلـدان، مـج٤، ل٤١٤).

(القزوینی/ آثار البلاد، ل.٢١٤
٤١-(سروج): شارێکە لە (حەران) نزیکە لە هەرێمی جەزیرە. (یاقوت، سەرچاوەی ڕابردوو، مج٥، ل٤٣).
(السیوطي، تأریخ الخلفاء، ل١٣٢).
٤٧-(نصیبین): شارێکی ئاوەدانە لە جەزیرە لەسەر شەقامی کاروانەکانی نەینەوا و شام، ئێستا دەکەوێتە بەشی کوردستانی تورکیا و سەر بە ویلایەتی (مێردینە). (یاقوت، سەرچاوەی پێشو، مج٨، ل٣٩٠). بۆ زانیاری پتر بڕوانە(ابن حوقل، صورة الأرض، ل١٩٣-.١٩٤
٤٨-ابن قتیبة، الإمامة والسیاسة، ج١، ل٤٦. (الیعقوبي، تأریخ الیعقوبي، ج٢، ل١١٢-١٢٣).
٤٦-(البیلقان: شارێکە دەکەوێتە ئەو دەشتاییەی لە نێوان (الکر) و(الرس) یان (ئاراس)دا درێژە دەبێتەوە، بەر لەوەی بەیەک ڕێڕەودا یەک بگرنەوە لە هەرێمی (الرّان-ئاران)ی هەنووکە لە جۆرجیا. (خرداذبة، المسالك و الممالك، ل١٢٠). (المقدسي، أحسن التقاسیم، ل١٥٩). (البکری، معجم ما استعجم، ج١، ل٢٧٩). (یاقوت، البلدان، ج٣، ل٤١٩).
٥٠-(البرذعة: ئەو شارە دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری (باب الابواب) (الشماخیە): نزیکەی (١٠٨کم) لە هی یەکەم و (٨٤کم) لە هی دووەم دوورە، لە هەرێمی (الران-ئاران)ی جۆرجیای هەنووکە.
(ابن خرداذبة، المسالك والممالك، ل١٢٢). (الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٩٢). (الادریسي، نزهة المشتاق، ل٢٨٥-٣٨٦). (یاقوت، البلدان، ج٢، ل٣٠٠).
٥١-الیعقوبی، تأریخ الیعقوبی، ج٢، ل١٥٧-.١٥٨
٥٢-هەمان سەرچاوە، ج٢، ل١٤٧-١٨٩-.١٩١
٥٣-ابن سعد (الطبقات الکبری، ج٢، ل٣٤٩، ج٦، ل.٢٤٧
٥٤-(محمد رضا الامام علی ابن ابي طالب (کرم الله وجهه) ، بڕوانە (الخلفا ءالراشدین، القاهرە، ١٩٣٩م، ل٥).
٥٥-شارەزور: بە کورەیەکی فراوانی وەسف کردووە لە چیا (الجبل)دا، لەنێوان هەولێر و هەوراماندا، چەند شارو دێهاتێك دەگرێتەخۆ، شارۆچکەکە (القصبە) شارێکی گەورە

بووە بە (نیم ئەزرای) ناسراو بووە، دەکەوێتە نێوان ڕێگای (طیسفون) و (شیز)، دەکەوێتە پارێزگای (سلێمانی) لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، ئەو دەشتە تا ئێستا هەمان ناوە مێژووینەکەی هەڵگرتووە.

(یاقوت، البلدان، مج٥، ل١٦٥). (نیم ازرای) وشەیەکی کوردی لێکدراوە واتە (نیوەی ڕێگا). (بڕوانە (حکیم احمد خۆشناو، الکرد وبلادهم عند البابلین والرحالە المسلمین، ل١٧٥، پەراوێز[٢].

٥٦-(الیعقوبی) تأریخ الیعقوبی، ج٢، ل٢٠٦، بۆ ڕاڤەی بزوتنەوەکە بڕوانە(فائزة احمد عزت، الکرد في اقلیم الجزیرة الشهرزور، رسالة ماجستیر منشورة، کلیة اداب، جامعة صلاح الدین، اربیل، ١٩٩٠ز، ل١١٠ بۆ دواوە.

٥٧-الیعقوبي، تأریخ الیعقوبي، ج٣، ل.٢٣

٥٨- هەمان سەرچاوە، ج٣، ل.٨٥

٥٩- فائزة محمد عزت، سەرچاوەی ڕابردوو، ل.١١٥

٦٠- السیوطي، تأریخ الخلفاء الراشدین، ل٢٥٥. أحمد عبدالعزیز محمود، الأمن في بغداد خلال العصر العباسي الأول، ل١٤٥-٢٤٧ك/ ٧٦٢-٨٦١ز). مکتب التفسیر للنشر والاعلان، اربیل، ٢٠٠٨م.

٦١-عبدالجبار الجومرد، هارون الرشید، ج٢، ل.١٨٥

٦٢-الیعقوبی، سەرچاوەی ڕابردوو، ج٣، ل١٠٠

٦٣-تأریخ الطبري، ج٨، ل.١٠٢

٦٤-ابن خلکان، وفیات الأحیان، ج٦، ل.

٦٥-تبریز: شارێکە نزیکەی (٥٥کم) لەخۆرهەڵاتی دەریاچەی ئورمی یە(ورمێ) دوورە لەبەشی خۆرئاوای دەشتایی تەبرێزەوەیە. (یاقوت، البلدان، مج٢، ل٤٣). (احمد عبدالعزیز محمود، الإمارة الهذبانیة الکردیة، ل٣٣-٣٤).

٦٦-(نریز): شارێکە دەکەوێتە باشوری دەریاچەی ئۆرمێ (ورمێ)وە، ئێستا شاری سیلدۆز) پێکی دێنێت.

٦٧-شوێنێکە لە شام، یاقوت، سەرچاوەی ڕابردوو، مج٨، ل.٣٥١

٦٨-الیعوبی، تأریخ الیعقوبی، ج٣، ل.١١٧

٦٩-سەرچاوەی پێشو، ج٣، ل.١٦٧

٧٠-سەرچاوەی پێشوو، ج٣، ل.١٦٨

٧١-المسعودي، مروج الذهب، ج٣، ل١٣٥

٧٢-شورات، گروپێکی کوردی خەواریجن، ناویان لە خۆیان دەنێن شورات، بە پشت بەستن بەم ئایەتە﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ ﴾ (التوبة: ١١١).

(الهمداني، صفه جزيره العرب، ل٢٤٧. بڕوانە (احمد عبدالعزيز محمود، علاقه الكرد بالخوارج، خلال العصر الاموي، ٤١-١٣٢ك/ ٧٤٩ز).

باسێکی بڵاوەکراوەیە لە گۆڤاری (الاستاذ)دا، ابن رشد، جامعة بغداد، ژمارە (٦٧) سالّی ٢٥٠-٢٦١.

٧٣-الهمداني، صفة جزيرة العرب، ل٢٤٧. نايف معروف، الخوراج في عصر الاموي، ل٢٥٠-٢٦١.

٧٤- معن بن زائدة الشيباني، (ابو الوليد معن) کوڕي (زائدة) کوڕی (عبدالله) کوڕی (مطر) کوڕي (شريك) کوڕی (الصلب) کوڕی (عمرو) کوڕی (قيس) کوڕی (شراحيل) کوڕی (مره بن همام) کوڕی (عدنان). لەلایەن خەواریجەکانەوە لە سبحستان سالّی (١٥٢ك/ ٧٦٩) یان (١٥٨ك/ ٧٧٤ز) تیرۆر دەکرێت. (ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ل٢٤٤-٢٤٨.

٧٥-محمد جاسم حمادي، الجزيره الفراتيه والموصل، ل.٥٧٤

٧٦- (دیار رەبیعە): سەرچاوەکان بەو ناوچانەی دەکەونە باکوری باشوری نەینەوا (موصل) دەڵێن دیار رەبیعە.

(ياقوت، البلدان، مج٤، ل٣٣٠). بۆ زانستی پتر بڕوانە (ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٦، ل٣٢٧).

٧٧-اليعقوبی، تأرخ اليعقوبی، ج٣، ل.١٦٩

٧٨-تاريخ اليعقوبی، ج٣، ل٢٨٣ بۆ دواوە.

٧٩-هەمان سەرچاوە، ج٣، ل٢٢١ بۆ دواوە.

٨٠-هەمان سەرچاوە، ج٣، ل ٢٢١-٢٢٢.

٨١-(حسین حوزنی موکری) ئاورێکی پاشەوە، ل.١٩

٨٢-زرار صدیق توفیق الکرد فی عصر العباسی حتی مجئ البوهیین، نامەی ماجستیر (بڵاونەکراوەتەوە، جامعە صلاح الدین، اربیل، ١٩٩٤، ل.١٠٠

٨٣-الیعقوبی، سەرچاوەی ڕابردوو، ل.٢٩٣

٨٤-توفیق، سەرچاوەی ڕابردوو، ل.١٠٠

٨٥-(الخرمیە): گروپێکی ئاینین، بۆ هەندێ لە بڕوایەکی ئێرانی کۆن دەگەڕێنەوە، وەکو ئایینی (مزدەکی) و (زەردەشتی)، لە سەدەی دووەمی کۆچیدا دەرکەوت، هەشتەمی زاینی، (بابك) بڕوای پێ بووە، نەیارانی عەبباسی لە سەرەتای سەدەی (٣ك/ ٩ز) بەرەوڕووی بوونەوە، (بابك) الخرمی پێ ناسراوە.

بۆ زانستی پتر بڕوانە (الاسفراینی (التبصیر فی الدین وتمییز مزقە الناحیە فی الهالکە، بلا ١٩٤٠م، ل٨٠.

(المسعودی، مروج الذهب، ج٣، ل٢٩٤، (یاقوت، البلدان، مج٣، ل٣٠٦. (حکیم خوشناو، الکرد وبلادهم، ل١٤٢).

٨٦-بندلی جوزی، من تأریخ الحرکات الفکریە، ل.٧٩

٨٧-هەمان سەرچاوە، ل.٨٣

٨٨-البلدان، ل.٤٤

٨٩-الیعقوبی، تأریخ الیعقوبی، ج٣، ل.١٩٥

٩٠-هەمان سەرچاوە، ج٣، ل.٢٠٣

٩١-هەمان سەرچاوە، ج٣، ل٢٠٤.

٩٢-هەمان سەرچاوە، ج٣، .٢١١

٩٣- (هذان) همذان: شارێکە لە نزیك کورەی (روزراور)، سێ فەرسەخ (٩کم) دوورە، ئیمڕۆ بە (ماە البصرە) ناودەبرێ.

(الیعقوبی، البلدان، ل٤١، القزوینی، آثار البلاد، ل٣٧٤).

٩٥-(مرند) شارێکی ناودارە لە (ازربیجان) دەکەوێتە باکوری دەریاچەی ئورمییە، (یاقوت، البلدان، مج٧، ل٢٥١).

٩٦-هەمان سەرچاوە، ج٣، ل٢١١-.٢٢٢

٩٨-وان: شارێکی ئەرمینیایە، شارۆچکەیێکە لە چیادا قـەڵای هەیـە، ئێستا دەکەوێتـە کوردستانی تورکیا، (ابو الفداء، تقویم، ل٣٩٨. (یاقوت، البلدان، مج، ل٤٤١).

٩٩-عبدالرقیب یوسف، الدولة الدوستکیة في کردستان الوسطی، ج١، ل.١٧

١٠٠-ارزن: شارێکی ناوداره، نزیك (خلاط)، قەڵایەکی عاسێی هەیە، ئاوەدانترین ناوچەی ئەرمینیایە، (اياقوت، البلدان، مج، ل.١٢٥

١٠١-بەدلیس: شارێکی دەوری ئەرمینیایە، دەکەوێتـە دۆڵـی نزیـك (خـلاط)، باخچـە و دارستانی زۆره، سێوەکانی نموونەی پێ دەهێنرێتـەوە لـە چـاکی و زۆری و هەرزانیـدا، (ناصر خسرۆ، رحله ناصر خسرو، ل٥١، یاقوت، سەرچاوەی ڕابردوو، مج٢، ل.٢٨٤

١٠٢-( خیلاط): شارۆچکەیەکە لە ئەرمینیای ناوەڕاست میـوه و ئـاوی زۆره، (یـاقوت، سەرچاوەی رابردوو، مج٣، ل٢٤١).

١٠٣-الیعقوبی، تأریخ الیعقوبی، ج٣، ل١٦٧-.١٦٨

١٠٤-هەمان سەرچاوه، ج٣، ل.٢٢٠

١٠٥-هەمان سەرچاوه، طبعة بیروت، ١٩٩٩، ج٢، ل.٣٣٤

١٠٦-هەمان سەرچاوه، ج٢، ل .٣٣٤

١٠٧-(الكرج): دانیشتوانی جۆرجیان، (یـەعقوبی) دەڵـێ: (خـەڵکانێکی مەسـیحین، لـە چیای (القبق) و شاری (السریر) دانیشتون، بەهێز و دەسەڵات دەبن، شـاری (تفلـیس) دەخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان، ویلایەتێکیان هەیە بەناوی خۆیانەوە، معجم البلدان، مج٧، ل.١٢٦

١٠٨-الیعقوبی، تأریخ الیعقوبی، ج٣، ل: ٢٢٧-.٢٢٨

١٠٩-الیعقوبی، البلـدان، الطبعـة لایـدن، ١٣٧٢هــ، طبعـة النجف، العـاملی، اعیـان الشیعه، ج١٠/ل:٣٣٥

١١٠-السیوطي: حسن المحاضرة في اخبار مصر والقاهره، ج٢، ل١٣

# کورد لە کتێبی مێژوویی (الطبري)دا

## مێژونووس (٣١٠ك/٩٢٢ز) کۆچی دوایی کردووە

کرداری نووسینەوەی مێژووی کورد، هەر لە سەرەتای تۆمار کردنەوە بە چەند قۆناغێکدا ڕەت دەبێ، لەهەموو قۆناغەکاندا کەسانێ هەڵکەوتون مێژوو بنووسنەوە، ئەوەی سەرنج ڕاکێشە زۆربەی ئەوانەی مێژووی کوردیان نوسیوەتەوە کوردن نەبوون، چونکە کورد دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی هێزی جیا جیاوە.

مێژونووسان بە نوسینەوەی هەواڵ و ڕووداوی پچڕ پچڕ و، لێرە و لەوێ هەڵساون بە چەند ڕەهەندێکی جیاوازەوە، هەندێکیان مێژوویان هەر لەسەردەمی خەلیفەوە نوسیوە، تا ئەو سەردەمی تێیدا ژیاون، لە وانەش (الطبري)، کە ئەم باسەمان بۆ ژیان و ڕێبازی لە کتێبە ناودارەکەی دا (تأريخ الأمم والملوك)دا بۆ تەرخان کردووە، سەرباری باسی کورد لەناو ئەو ڕووداوانەی تۆماری کردوون، لەگەڵ دەرهێنانی ئەو سەرەنجامانەی لەو گێڕانەوانەدا هاتوون تایبەت دەبن بە گەلی کوردەوە.

مێژوی (الطبري) لەو کتێبانە هەژمار دەکرێ، کە مێژووی گشتییان نووسیوە، بەڵام ئاماژە بەو ڕووداوە گشتییانە دەکات، کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە کوردەوە هەیە، وەك ئاماژەمان بۆ کرد، لەبەر ئەوە بە کارێکی نایاب و مەزن هەڵساوە بۆ خزمەتی مێژووی دەوڵەتان و پادشایان و میللەتان و نەتەوەکان، وێڕای خزمەتی بە

گەلی کورد لەو بوارەدا، کە هەواڵ و باسی ئەوانیشی پشتگوێ نەخستووە و تۆماری کردووە.

لێرەدا دەتوانین بڵێین گەر مێژووی (الطبري) و هەندێ مێژووی تر نەبوایە، هەواڵ و باسی کورد لەناو کۆگای کتێبەکاندا بزر دەبوو.

ئەم باسە بابەتییەمان بەسەر چوار تەوەردا دابەشکردووە:

**تەوەرەی یەکەم:** تایبەتە بە ژیانی (الطبري) کتێبەکەی (تأریخ الامم والملوك- تاریخ الطبري) و سەرچاوەکانی نوسینی و ڕێبازی لەنووسینەوەی مێژوودا.

**تەوەرەی دووەم:** تەرخان کراوە بۆ ئەو هەواڵانەی کە (الطبري) لە بارە کوردەوە باسی کردوون بەر لە هاتنی ئیسلامدا، سەرباری گرتنی ناوچە کوردنشینەکان لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدینەکاندا (ڕەزای خوایان لێ بێ) (١١-٤١ك/ ٦٣٢-٦٦١ز).

**تەوەری سێیەم:** تەرخانم کردووە بۆ هەواڵی کورد لە ژێر باڵی دەسەڵاتی ئومەویداو ئەو بزووتنەوە و سەرهەڵدانانەی کورد بەشداری تێدا کردوون دژ بە دەوڵەتی خێڵی ئومەوی دا( ٤١-١٣٢ك/ ٦٦١-٧٤٩ز).

**تەوەری چوارەم:** باسم لە کورد کردووە لە دەوڵەتی عەبباسیدا و ڕۆڵیان لە بڵاوکردنەوەی بانگەوازی عەبباسیدا و باسکردنی هەندێ لە کەسایەتیە کوردەکان لەم دەوڵەتەدا، وێڕای ئاماژە کردن بەو بزووتنەوانەی کورد پێوەی هەڵساوە و بەشداری تێدا کردووە لە دژی دەوڵەت و خەلافەتی عەبباسیدا.

ئەم پوختەیە ماوەیەکی زۆری لە ژیان بردومە، تا نوسیوومەوە، لە تاوتوێیەکی درێژدا پێشکەشی دەکەم بە مێژوو نوسێك، شایان بەوەیە نازناوی سەرداری مێژوونووسانی پێ بدرێ لە مێژووی ئیسلامیدا، تەواوی داواکاری من ئەوەیە بەخت و شانس یاوەرم بێ، کە وێنەیەکی ڕوون بە ڕواڵەتە جۆراوجۆرەکانی

جیهانی ئیسلامی ببەخشم، لە سەدەی (١٣ی کۆچی/ ٩زایینی)دا، هەروەها بەو مێژوونووسە بەڕێزە و لایەنە جۆراوجۆرەکانی، کە خاوەنی زۆر باس و نووسینە، تا بکەوێتە بەر دەستی لێکۆڵەرانی کورد، کە دەیانەوێ هەڵوێستە بکەن لە سەر لایەنی سیاسیی و ئیداریی و شارستانیی و ئابووریی ژیانی کورد لەو چەرخەدا، بارودۆخی شارەکان و هەرێمە کوردییەکان لەناو بازنەی جیهانی ئیسلامی ئەو سەردەمەدا بزانن.

خودای گەورەش یارمەتیدەر و ڕێنموکارە.

# باسی یەکەم

## ژیاننامەی (الطبري)[1]:

ناوی تەواوی (طبري): (ابو جعفر) کوڕی (جریر) کوڕی (یزید) کوڕی (کثیر)ە، (الطبري) له (تەبرەستان) چاوی به دنیا هەڵهێناوه و له کۆتایی (٢٢٤ك/ ٨٣٨ز)دا لەدایك بووه، هەر له تافی منداڵییەوه گەشتی خوێندنی کردووه، وەکو زانا موسڵمانەکانی سەردەمی خۆی کردووه، دەڕواته (بەغداد) پاشان بەرەو (میسر) و شاری (کەنانە) دەچێت، لەوێوە بەرەو شام و عێراق، سەری خۆی هەڵدەگرێت، زۆر زانست و زانیاری کۆدەکاتەوه، لەهەموو بواره زانستییەکاندا، خۆی پڕ زانیاری دەکات.

پاشان له شاری بەغداد (دار السلام) دادەنیشێت، دەست به خوێندنی (فەرمووده) و (فیقه) دەکات و بەر دڵی دەکەون و کاری تێدەکەن، سەردەمی ئەو به چاخی دەمەقالێی و دەبەرێکراچوونی (کەلامی) ناسراوه له نێوان پێڕی (ئەهلی سوننه) و (موعتەزیله)، که خاوەنی مەزهەبی (فکریی) بوون، له هەموو پێڕە ئیسلامییەکاندا زیاتر کەوتوونەته ژێر کلتوری (یۆنانی)یەوه، (الطبري) زانیاری باشی له بارەی لۆژیك (المنطق)ەوه دەبێت.

دیسان ئاشنایەتی باشی لەگەڵ ماتماتیك هەبووه، هاوکات ڕەوتی سوننەتی گەری پارێزگاری بەسەردا زاڵ دەبێت[2].

ڕۆشنبیری فراوانی لە فیقهو فەرموودە هەبووە، بەرهەمە مەزنەکانی لە ڕێگـای کتێبی (تأريخ الامم والملوك) دەست ئێمە گەیشتووە، کە مێژوویەکی گشتگیرە لـە ڕاست مرۆڤـایەتییەوە،کە بـەپێی سـاڵەکان ڕێکخـراوە، لـە سـەرەتای مێـژووەوە دەست پێ دەکات تا (٣٠٢ك/ ٩١٤ز)، لە چەند بەرگێك پێك دێت، (الطـبري) لـە نووسراوەکەیدا ڕێگای (اسـناد) بـەکاردێنێت، ڕوانـینی ئـەو، تـا ڕادەیـەك وەکـو فەرموودە زان و فەقیهی توێژینەوەی سەرەتایی و ڕۆشنبیریەکەی کاری تێ کـردووە، بۆیە لەو بازنەیەدا لە کاتی تۆمارکردنی مێژوودا جولاوەتەوە [٣].

(الطبري) لە ڕووی ڕۆشنبیریەی مێژوویی ئیسـلامییەوە، جێـی ڕێـزی زانایانـە، چونکە لە تاووتوێ کردنی بابەتە گرنگ و هەستیارەکاندا وردەکار بووە، لە سـایەی هەڵسانی بە کۆکردنـەوەی کەرەسـتەی زانسـتی وەرگـیراو لـە کتـێبی فـەرموودە و تەفسیرو زمـان و ئـەدەب و ژیاننامـە و غەزانامـە و، تـا دەقـی شـیعر و وتـار و پەیمانەکان و تێکست و دەق و بەڵگەنامـە مێژووییـەکان و ئەدەبیـەکان، (الطـبري) جێگایەکی تایبەتی لەنێو زانا موسڵمانەکاندا بەدەست دەهێنێت.

## ٢-پێناسەی کتێبی (تأريخ الامم والملوك):

ئەو کتێبە گەورەیە (تأريخ الامم والملوك) مێژووی گشـتیی پـۆلین دەکـات، بـە دروست بوونی جیهانی دەست پێ دەکـات و لـە (٣٠٢ك/ ٩١٤ز) کۆتـایی دێـت، سنورێکی زەمەنی هەیە، لە چەند بەرگێك دایە بە (تأريخ الامم والملوك) ناسـراوە، یان (تأريخ الرسل والملوك) یان (تأريخ الطبري).

لە بەرگی یەکەم و دووەمدا بە پشت بەستن بە قورئانی پـیرۆز، باسـی مێـژووی مرۆڤـایەتی دەکات لە یەکەم ڕۆژی دروستبوونیەوە، پاش ئـەوە تایبـەتی کـردووە بەمێژووی (ساسانیەکان)ەوە لـە (٢٢٦-٦٥٠)ز، لـە بڕواپێکراوتـرین سەرچـاوەی

بنەڕەتییــە، کــە پشــتی پــێ دەبەســترێ بــۆ زانــینی مێــژوو و کەســایەتییە مێژووییەکان[٥].

هەروەها باس لە سێ سەدەکانی کۆچی دەکات، بە وردودرشتی دەبەری ڕاچووەو زانیاری گشتیی هێناوەتەوە، ڕووداوی سەردەمی خۆی پشتگوێ خستووە.

هەلی زەمانی و شوێنی، لای (الطبري) بەستراوەتەوە بە گێڕانەوەیــەك تــا چــەند گێڕانەوەیەك، ئەو هەندێ ڕووداو زیاتر لە جارێك دەگێڕێتەوە، هیچ گێڕانەوەیەك بە چاكتر دانانێ لە گێڕانەوەی تر، ئەو، هەڵوێستی بێ لایەنی دەگرێــت[٦]، لــە بــواری هەنوكە دوور دەكەوێتەوە، وەك ئاماژەمان بۆ كرد.

دیسان (الطـبري) لە كتێبەكەیدا ئەوەی مێژوونووســان پێــوەی هەڵســاون تــەواو دەكات، وەكو (الواقدی) (ت٢٠٧ك/ ٨٢٢ز)، (ابــن سـعد) (ت ٢١٠ك/ ٨٤٤ز) و (الـبلاذري) (ت ٢٧٩ك/ ٨٩٢ز)، (اليعقـوبی( ت٢٩٢ك/ ٩٠٥ز)، زەمینــەش بــۆ مێژونووسانی دوای خۆی خۆش دەكات وەكو: (المســعودی: ٣٤٦ك-٩٥٧ز) و (ابــن مسكويه (ت ٤٢١ك/١٠٣٠ز) و (ابن الأثير) (ت ٦٣٠ك/ ١٢٣٢ز)، (ابن خلدون) (ت ٨٠٨ك/ ١٤٠٥ز). دیار نییــە بــە وردی لــە كــام كاتــەوە مێــژووی (الطـبري) دەستی پێكردووە، بەڵام پێ دەچێ لــە دوای نووســینی ((تفسـير الطـبري) دەســتی پێكردبێت.

(الطبري) لە مێژووكەیدا بــە بەڵگــە ئامــاژەی بــە ڕوودانــی زەمــەنی كــردووە، ئاماژەی كردووە دوای ئەوەی خوا خامــە (قەڵــەم)ی دروســت كــردووە، دوای ئــەوە شتی تری وردە ورد بەدیهێناوە، وەك لەگێڕانەوەكاندا هاتووە، پاشان باسی (ئــادەم) دەكات (سەلامی خوای لێ بێ)، دوایی وەكــو ریزبەنــدی تــەوڕات، پێغەمبــەران و ڕەوانەكراون بە دوای یەكتردا بــاس دەكــات، ئــەو ڕووداوانــەی لــە چــاخی ئەوانــدا ڕوویداوە دەخاتەڕوو، ئەو ڕوودانەی لــەو ســەردەمەدا ڕوو دەدەن پیشــانیان دەدات،

ئەوەی لە قورئانـدا هاتووە لـەدەربارەیان، بەپێی زانیـاریی هەواڵی پادشـایان سەردەمی ئـەوان باسیان دەکات. بە تایبـەتی هـەواڵی ئەو گەلانەی دوای پێغەمبەران هاتوون، تا دەگاتە کاتی هاتنی پێغەمبەری خودا (موحەممەد) (صلی الله علیه وسلم).

هەرچی بەشی ئیسلامییە، بەپێی ڕووداوەکـان ڕیزبەنـدی کـردووە، لـە سـاڵی کۆچییەوە، تا ساڵی (٣٠٢ك/ ٩١٤ز)، لەهەر یەك لەو سـاڵانەدا ئـەو ڕووداوانـەی باسکراون و ئەو ڕۆژانەی ناویان دەرکردووە باسی کردوون، ئەگەر ئەو هەواڵانە درێژ بن، بەپێی ڕیزبەندی ساڵەکان کورتیان دەکاتەوە، یاخود بە پـوختی ئاماژەیـان بـۆ دەکات، دوایی لە شوێنێکی گونجاودا باسییان دەکات[٧].

زۆر تۆکمەکاریی و کورتکردنەوە و نووسراو بۆ ئـەم کتێبـە دانـراوە، دوور نییـە (الطبري) خۆشی زیادەی خستبێتە سەر، هەرچـەندە هیچـی ئـەومان لـە بارەیـەوە بەدەست نەگەیشتووە.

دیسان (عبدالله)ی کـوڕی (احمـد) کـوڕی (جعفـر الفرغـانی)، خۆیشـی بـەپێی گێڕانەوەی (یاقوت) ئەم کارەی کردووە.

لەکتێبخانەی میللی لە پاریس، دەستنوسێکی هەیە لە بەشی یەکـەمی کتـێبی (محمـد بـن عبـدالملك (الهمـذاني) (ت ٥٢١ك/ ١١٢٨ز)، کـە کردوویـەتی بـە تەواوکەری ئەو، لە ڕۆژانی خەلیفە (المقتدر ابو فضل جعفر بن المعتضد) دەست پـێ دەکات، کە گروپـی (مـؤنس)/ مـردن ٣٢٠ك/ ٩٣٢ز)[٨] لەسـەر دەسـتی ئـەودا دەکوژرێن، تا دەگاتە سەرەتای خەلافەتی (المستظهر بالله ابو العباس احمد المقتـدي) (مردن ٥١٢ك/ ١١١٨ز)[٩]، پاشماوەی تری کتێبەکـە بـە هـەواڵی (عضـد الدولـة) کۆتایی دێ، واتە لە سەرەتای ساڵی (٣٦٠ك/ ٩٧٠ز)دا.

ئەم كتێبە زۆر كەس كورتی دەكاتەوە، لەوانە (ابن النديم - ابو الفرج محمد بن يعقوب اسحاق ( مردن ٣٨٣ك/ ٩٩٣ز) و (محمد بن سليمان الهاشمی) و (ابو الحسن الشمشاطي) لە نەينەوادا، كە بە (سليل بن احمد) دەناسرێ.

ديسان (عريب بن سعد القرطبي (مردن ٣٦٦ك/ ٩٧٧ز) كورتی دەكاتەوە لەگەڵ زيادكردندا. (ابن عذاري المراكشي) ابو عبدالله (مردن ٧١٢ك/ ١٣١٢ز) ئەو مێژووە دەگوازێتەوە، كە تايبەتە بە مێژوی ئەفريقيا و ئەندەلوس، كتێبەكەی باسی (المغرب)ی نەكردووە، هەرچی دەنگوباسی عێراقە، وەكو پاشكۆيەكی مێژوو بە ناوی (صلة تأريخ الطبري) لە ساڵی (٢٩١ك/ ٩٠٣ز) تا (٣٢٠ك/ ٩٣٢ز) چاپ دەكرێت [١١].

(تأريخ الامم والملوك) يەكێكە لەو كتێبانەی،كە لێكۆڵەری مێژووی ئيسلامی سەدەكانی سێيەمی كۆچی، ناتوانێ پێويستی پێی نەبێ، گێڕانەوەكانی درێژوجۆراو جۆرە، هەموو هەل و مەرجەكان دەگێڕێتەوە، بە فراوانی ڕووداوە سياسيەكان دێنێتە گۆڕێ و زانياری تەواو دەداتە دەستەوە.

## ٣-سەرچاوەكانی كتێبەكان:

ئەوەی پەيوەندی بە سەرچاوەكانی (تاريخ الامم والملوك)ەوە هەيە، لەگەڵ بوونی بەهای خوديی گێڕانەوەكان، پشتی بەهێزی ئيسنادەكانی بەستووە، تا ئيسنادەكە لەڕووداوەكە نزيكتر بێ، زياتر دەبێتەجێی متمانە، ئەو، كامەيان دروست ترە، ئەوە هەڵدەبژێرێ لەناو ئەو وتانەی لەو كاتەدا بڵاوبووينە، (الطبري) لەم كارەدا بەهەمان كاری (مسلم) و (البخاری)، لە ڕاست فەرمودەكاندا هەڵدەستێ.

لەبەر ئەوە (الطبري) زانستی خۆی زۆر باس نەكردووە، ڕووداوەكانی سەردەمی خۆی بە تەواويی پشتگوێ خستووە، وەك ئەوەی شايانی نوسينەوە نەبن، يان لەبەر

ئەوە بووە ترساوە تۆمەتی لایەنگیریی بدەنە پاڵ، زۆر بە کورتی بەسەریاندا ڕەت بووە، بۆیە بە شاهید حاڵی سەردەمی خۆی دادەنرێ، زۆر گومانی لە شاهیدی خۆی کردووە، وێنەی ڕووداوەکانی سەردەمی ئەو بە کزی هاتووە، بە ئەنقەست بێ، یان بە نەزانییەوە بووبێت، گرنگی بەو بوارە نەداوە [١٢].

ئەو، هەموو زانستێکی لە پیاوی پسپۆڕی خۆی وەرگرتووە، (تەفسیر)ی لە پیاوانی وەکو: (مجاهد) و (عکرمه)، یان لە کەسانی تر وەردەگرێ، کە لە (ابن عباس)ەوە گێڕاویانەوە، سیرەو ژیاننامەی لە (ابان ابن عثمان) (مردن ٨٥ك/ ٧٤)و (عروة ابن الزبير) و (شرحبيل بن سعد) و (موسى بن عقبه) و (ابن اسحاق) وەرگرتووە. هەواڵی هەڵگەڕانەوە و گرتنی وڵاتانی لە (سيف بن عمر الاسدى) وەردەگرێ[*]، ڕووداوەکانی (الجمل) و (الصفين) لە (ابن منخنف) و (المدائنى) (مردن ٢٤٤ك/ ٨٣٨ز)[١٣] وەردەگرێت.

مێژووی ئومەوییەکان لە (عوانة بن الحكم) و هەواڵی (عەبباسیەکان) لە نووسراوەکانی (احمد بن ابى الخثيمة) (محمد بن كعب القرظي) و (وهب بن منبه) وەردەگرێ، هەواڵی فارسەکان لەو کتێبانە وەردەگرێ، کە لە زمانی فارسییەوە بۆ عەرەبی وەرگێڕدراون، بە تایبەتی نوسراوانی (ابن المقفع) و (ابن الكلبي) (مردن ٢٠٤ك/ ٨١٩ز)[١٤].

دیسان سوودی لە (الواقدی) و کەسانی تر وەرگرتووە، وەك لە باسە زۆرەکانی مەوادەکانی (الطبري) دا دەکەونە بەرچاوت.

---

(*) (سيف بن عمر): (ابن حجر) له (التهذيب) دا دەڵێ: (ضعيف الحديث)ە (ابن حبان) دەڵێ: (زەنديق) بووە. (وەرگێڕ)

## بیرۆکەی مێژوو لای (الطبري):-

درووسـت بـوونی (مێـژووزانیی) لای موسـڵمانان لـه ڕووی بابـەتی بـاس و ڕێبازەکەی تێکەڵ به (فەرمودەزانی) کـراوە، بـەڵام بابەتەکـه لـه ڕاسـت هـەواڵ و فەرمودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) غـەزا و ژیاننامـەی موسـڵمانان دەدوێ، ڕێبازەکەش بریتییه له گرنگیدان به باس کردنـی سـەنەدەکان و سـەلماندنی گێڕانـەوە و ئیسـنادە، لـه ڕاسـت چـەمکی تایبـەت بـه مێـژووەوە، مێـژووی مێژوونووسان له ماوەی سێ سەدەی سەرەتایی کۆچی بڵاوبۆوە[١٦].

ڕەچـەی (الطـبري) بـۆ لەسـەر ڕۆیشـتن، ڕەچـەی فـەرموودە زانـان بـووە، ئـەو ڕووداوەکان به ئەنـدازەی ڕێگاکـانی خـۆی دەگێڕێتـەوە، سـەنەدەکه تـا دەگاتـەوە خاوەنەکەی دەگێڕێتەوە، زۆربەی جار هیچ ڕایەك دەرناخات، له زۆربەی کتێبەکـەدا ئەم ڕێبازە پەیڕەو دەکات، جگه لەوە لەکتێبەکان شت وەردەگرێ‌و، جار هەیه ناوی ئەو کتێبه دەدات، که هەواڵەکەی لێوەرگرتووە.

(الطبري) ڕۆشنبیرییەکی ئایینی دێرین و قووڵی هـەبووە، لـه ئاسـتی زۆرێ لـه هاوچەرخانی خۆیدا، ڕێبازی فەرموده زانانان کاری تێـدەکات، بـڕوای وانـەبوو لـه نووسینی مێژوودا، بۆ مێژوونووس درووست بێـت، پـەنا بباتـه بـەر بـەکارهێنانی لۆژیك (المنطق) و پێك گرتن (القیاس) و هەڵێنجان (الاستنباط)، له کاتـێ ئـەوەی بۆ درووست دەبێ ئەنجامی بدات، که له بواری فیقهزانیدا موجتەهید بێ و پشت به تێکست و دەقه بڕوا پێکراوەکان ببەستێت، مێژووی بەم نـاوە، تـەنیا ڕێکخسـتنی گێڕانـەوەکان و سـەلماندنی تێکسـتەکانه و لێکۆڵینەوەیەکـه لـه سـەنەدەکان و قەواڵەکان، بەر لەوەی سەیرکردنێکی ناوەڕۆکی گواستنەوەکان بێ، یـان ڕامانـەکی فەلسەفی بێ، له ناوەڕۆکدا مەنهەجی بێت)[١٧].

پشت بەستن بەو مەنهەج و ڕێگایە، دەبێتە جێگای ڕەخنە و سەرکۆنەی هەندێ لە لێکۆڵەران و وتوویانە: (گێڕانەوەی هەواڵەکان، بێ لە بێژنگدان مەسەلەیەکە شایانی مێژوونووسێکی ڕەخنەگری دووربین نییە، گەر ڕێگای گێڕانەوەی هەواڵ بە سەنەد و پیاوە ناسراوەکانەوە بێ، لای زانایانی (الجرح والتعدیل)، ڕاستی هەواڵەکان و لەبێژنگدانی ئەو ڕووداوانە لە خۆ بگرێ، کە لە ئیسلام ڕوویان داوە، ئەو کات ئەو ڕێگایە مەبەستی دروستی ئەو ڕێگایەیە، بەر لە ئیسلامدا ڕوویانداوە، بە تایبەتی کە زۆر هەواڵی ناڕاست لەم مێژووەدا ڕوویداوە و، زۆر چیرۆکی درۆی تێدا باس کراوە، دیسان زۆر فەرمودەی هەڵبەستراوەی هێناوە، کە فەرمودەزانان پێیان ڕازی نین،کە لای (الطبري)، هاتووە، بەڵام فەرموودە زانان خۆیان لێ پاراستون، فەرمودەکانیان بە ڕێگاکانی خۆیان و پیاوانیانەوە باس کردوون، بە مەبەستی پاراستنی زانست و دوورخستنەوەی لە ئۆباڵی خۆیان بڕیاری ئەوەیان بۆ خوێنەر لێگەڕاوە)[18](*).

(الطبري) لە پێشەکی مێژووەکەی نەخشەی خۆی لە ڕاست بۆچوونی خۆی لە بارەی بیرۆکەی مێژوو و ڕێبازەکەی لەم دەقەیدا دەخاتەڕوو: (ئەوکەسەی لە کتێبی ئێمە دەڕوانێ، بابزانێ پشت بەستنی من بە هەموو ئەو شتانەی لەناومدا باسکردون و بەپێی ئەو گێڕانەوەیانە بەسەنەد گێڕاوغەوە بۆ ڕاوییەکانیان، بێ ئەوەی بگەمە بەڵگەی زانایان و بیاندۆزمەوە، تەنیا کەمێك نەبێ لەوانە.

گەر زانیاری بوون بە هەواڵی ڕابردوان و بە هەواڵی تازەکان نەگەیشتووە و، نەیان بینیوە و بە ڕۆژگاری ئەوان نەگەیشتوون، تەنیا بە هەواڵی هەواڵ دەران و

---

(*) بەڵام من پێموایە (الطبري) فەرموودە زان بووە، هەم موفەسیرو هەم مێژوونوسێکی کەم وێنە، ئەم قسانە زیادرەوییە لەبارەی مێژووەکەی گوتراوە (وەرگێر).

گێڕەرەوان نەبێ، بێ ڕەچاوکردنی سۆراغ کردنی کەسان، ئەوەی لە کتێبی مندا هاتووە لەڕاست هەندێ لە پێشینان، کە ڕەنگە خوێنەر بە دڵی نەبن، یان گوێگر بە دزێو سەیریان بکات و بە ڕاستیان نەزانێ، با بزانێ ئەوە ئێمە باسمان نەکردووە، بەڵکو لە ڕێگای هەندێ هەواڵی دەرەوە بۆمان گوازراوەتەوە ، چۆن بە ئێمە گەیشتووە، ئاوا گێڕاومانەتەوە)[١٣].

(الطبري) پەیوەست بوو، بە ڕاسپاردەی ڕێبازی عەرەبی ئیسلامی لە ڕووی دادگەریی و ڕێکی و وردی ئیسنادەکان، ئەمەی بە گشتیی لە کتێبەکەیدا پراکتیك کردووە، دەبینین جار هەیە لەبەرامبەر زۆرێك لە گێڕانەوەکانی، هەڵوێستی سەلبی نواندووە، هەوڵی نەداوە ڕەخنە لە هەندێ لەو ناوەڕۆکانە بگرێ، پێچەوانەی هزر و لۆژیکن، مادام سەنەدەکان درووستن، لەگەڵ ئەوەشدا (الطبري) گواستنەوە و ڕاسپاردەی بە چاك و ڕاستی داناوە، ڕاستی لێرەدا بۆ سەرچاوە دەگەڕێتەوە، نەك ناوەڕۆك، ئەمە بناغەیەکە لە بناغەکانی ڕێبازی ئیسلامی عەرەبی لە گێڕانەوەدا)[٢٠].

(الطبري) هەواڵەکان بەپێی گێرەڕەوەکان دەهێنێ، بەبێ لایەنی بابەتیانە دەیانخاتەڕوو، هەر گێڕانەوەیەك، کە دەگێڕێتەوە بۆ سەر خاوەنەکەی، نەك هەر ئەو شتانەی گێڕابنەوە لەگەڵ ڕای ئەودا دێننەوە، کەم وایە پەیوەست دەبێ بە بەڕاست دانان و بە درۆخستنەوە، بەڵکو جیاکردنەوە لەنێوان گێڕانەوەکاندا لەسەر خوێنەرە، دیسان فەرمودە زانان ئاوڕ لە گەیشتنی سەنەدەکەو نزیکی لە بنەمای ڕووداوەکە دەدەنەوە، دیسان (الطبري) گوێ بە گێڕانەوە دەدات، گەر سەنەدەکە بە پیاوێکی نزیك لە ڕووداوی مێژوویییەکە دەست پێ بکات.

(مارجلیوت) لەبەر ئەوەیە دەڵێ: (کاری فەرموودەزانەکانی هاوچەرخی (الطبري)، لەناو فەرمایشتە باوەکاندا هەڵساون ڕاست و دروستەکانیان

هەڵبژاردووە، مەرجەکانیان جیابووە، بەڵام هەموویان کۆك بوون لەسەر بەڕاست دانانی ژمارەیەکی مامناوەند لەوانە، گەڕانەوە بۆیان لە تەشریعدا، پێمان وایە (الطبري) له مێژوودا، هەمان ڕێچکەی هەڵبژاردووە، کە بوخاری و موسلیم لە فەرمودەدا ڕەچاویان کردووە، کە هەڵبژاردنی ماددەی مێژووی دروستە لە کۆمەڵێ لەو ماددانەی (المدائنی) و کەسانی تر لە نووسراوەکانیدا پێشکەشیان کردووە، ئەمەش تا ڕادەیێ دژوار و ترسناك بووە، تا چاخی ئەو، بەردەوام نووسین ئەنجام دراوە)[٢١]

(الطبري) و زۆر لەوانەی لەبارەی مێژووی کۆن شتیان نووسیوە لەسەر سیستەمی ساڵانە، ڕۆیشتوون لە گێڕانەوەی ڕووداوەکاندا و ساڵ لە دوای ساڵ باس دەکات، بێ گوێدان بە ڕووداوەکە وەکو ڕووداوێکی سەربەخۆ، یا زیاتر لە ساڵێکیشی خایاندبێت، لە سەرەتای کۆچییەوە دەست پێ دەکات، دەبینین نووسەر ڕووداوەکە تەواو ناگێڕێتەوە و بە کۆتایی ساڵ، ڕووداوەکە تەواو دەکات و باسی تەواوی ڕووداوەکە ناکات)[٢٢].

(الطبري)و هاوچەرخەکانی ئەو گرنگییان بە تاووتوێی سەنەد و ڕەخنەگرتن لە پیاوان داوە، بێ ئاوڕدانەوە لە ناوەڕۆکی دەقە گوازراوەکە، وەك لە فەرمودەزانیدا هەیە، بە مشێوەیە لە ڕوانگەی (الطبري) و کەسانی پێش ئەو، کە ئەم ڕێبازە هەڵدەگرن و (المأثورات) ڕەچاو دەکەن لە تاووتوێی مێژوویيدا هیچ ڕامانێکی فەلسەفیمان لەڕاست بیرۆکەی مێژوو بەرچاو ناکەوێ، بەڵکو دەبینین (الطبري) بزووتنەوەی مێژوویی لە ڕێگای ڕامانی فیقهی و کەلامییەوە سەیر دەکاتو، گرنگی بە دەرخستنی واتای چاودێری خوایی دەدات، گوێ بە بیرۆکەی تەواوکاری پەیامە خواییەکان لە مێژوودا و، یەك بوونی جەوهەرییان دەداتنو مێژوو بەو چەمکەیە، ویستێکی ڕەهای خودايیە.

مێژووی (الأمم والملوك) هاوشانی تەفسیرەکەیەتی (جامع البیان عن تأویل القران)، چۆن مێژووەکەی لوتکەیە لە مێژووی گوازراوەدا، تەفسیرەکەشی لە تەفسیری فەرمودەییی لە لوتکە دایە)[٢٣].

نموونەی ئەو ڕێبازە مێژووییەی، تەنیا لە سەر گێڕانەوە و بە سەرهات دادەمەزرێ لە ڕاست سەرچاوەکانی باسەکەدا، زۆر کێشەی دێتە ڕێگایەوە، گەر (الطبري) لەسەر دامەزراندنی سەنەدەکانی لەهەموو بارەکاندا بەردەوام بوویێ، ئەوە ناتوانێ هەموو ڕاستییە مێژووەکانی هێناوینەوە بە زنجیرەی سەنەدی بیانهێنێتەوە، کە لە زۆر کۆنەوە ڕوویانداوە، لەوانە ئەو ڕووداوانەی بەر لە هاتنی ئیسلام قەوماون و گێڕاوینەوە، جگە لە قورئان و سوننەت، هیچ سەرچاوەیەکی بڕوا پێکراوی بە دەستەوە نییە، لە کاتێکدا ئاماژە بۆئەو دەقانە دەکات، پەنا بۆ ئەو تەفسیراتانە دەبات، کە گێڕانەوەی ئیسرائیلییاتیان گێڕاوەتەوە، لە مێژووی فارسدا سوودی لەو سەرچاوە عەرەبیانە وەرگرتووە،کە بۆ سەر زمانی عەرەبی وەرنەگێڕدراون، بۆ مێژووی ڕۆم، سوودی لە کتێبی مەسیحییەکانی شام وەرگرتووە، کە هەندێ زانیارییان لە بارەی مێژوی دەوڵەتی ڕۆمانی شتی تر هەبووە)[٢٤].

## باسی دووەم

## دەنگوباسی کورد بەر لە ئیسلام لای (الطبري):

(الطبري) باسی کردووە (نەمرود) و شوێنکەوتوانی لەسەر کوشتنی ئیبراهیم خەلیل (علیە السلام) یەك دەنگ دەبن و دەڵێن: **(قَالُوا حَرِّقُوهُ وَ انْصُرُوا آلِـهَتَكُمْ)** (الانبیاء: ٨٦). واتە: بیسوتێنن خواکانتان سەربخەن. ئاماژە دەکات ئەو کەسەی ئاماژەی بە سووتاندنی ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێ) کرد ئەعرابێکی فارسی بووە، پرسیارکرا ئایا فارس ئەعرابی هەیە؟ وتی: بەڵێ، کوردەکان ئەعرابی فارسن)[٢٦].

لە هەواڵی (ئەردەشێری بابك)دا باسکراوە، کە دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانی بووە: (پەیامنێری ئەردەوان نامەیەك بۆ ئەردەشێر دێنێ، ئەردەشێر خەڵکەکە بۆ ئەو مەبەستە کۆدەکاتەوە، تا نامەکە بە ئامادەبوونی ئەوان بخوێنێتەوە،کە لەوێدا هاتبوو: تۆ سنووری خۆت تێپەڕاندوە، مردنت بۆ خۆت هێناوە، ئەی کوردی پەروەردە کراو لە تاوڵ و چادری کوردەکاندا؟ کێ پێی گوتووی ئەو تاجەت بکەیە سەر، ئەو وڵاتانە دەست بەسەردا بگریت)[٢٧].

دیسان (الطبري) باسی (کیسرا پەروێزی کوڕی هورمز)ی کردووە:

(لە ژیانی باوکیدا (بەهرام ) هەوڵیداوە پادشایەتی لە دەست باوکی دەربێنێ، دوایی لەسەر دەسەڵات کێشە لە نێوان کیسرا و بەهرامدا پەیدا دەبێ و

مشتومڕێکی درێژ ڕوودەدات، (بەهرام) بە (پەروێز) دەڵێ: (ئەی کوڕی سۆزانی گەورە بوو لە چادری کوردەکاندا)[٢٨].

(بەهرام) خوشکێکی هەبوو بەناوی (کوردییە)، ژنەکەی تەواو و ژیر هەڵکەوتبوو، بەهرام دەیخوازێ، بەهرام دەبوغزێنێ، چونکە خراپ مامەڵە لەگەڵ کیسرادا دەکات، دەیەوێ بچێتە ژێر ڕکێفی ئەوەوە، بەڵام قایل نابێت.

(پەروێز) پیاوان و ژنانێ کۆدەکاتەوە لە گروپێکی کەمدا، (بەندوییە) و (بەستام) و (کوردی) برای بەهرامیان لەگەڵدا دەبن، ...پەروێز شەڕی بەهرامی کرد بە تەنیایی لە سەربازگەدا(١٤) کەسی لەگەڵدا بوون، لەوانە (کوردی) برای بەهرام و خاڵەکانی، بەناوی (بەندوییە) و (بەستام)، بەهرام بەرەو لای تورکەکان ڕایکرد، پەروێز توانی دیارییەکی زۆر بۆ تورك بنێرێ، تا خاتونی ژنی پادشا بەو گەواهیرانە ڕازی بکات و پلان بۆ کوشتنی بەهرام بکێشێت، گوتراویشە (خاقان) کوشتنی ئەوی ڕەچاو کردو هەواڵی بۆ کوردییەی خوشکی و هەم خێزانی نارد، تا هەواڵی پێ بدات و داوای هاوسەرگیریی لێ بکات، ئەویش قبوڵی کرد و بە نەرمی وەڵامی دایەوە و لێیبورا.

ئەوانەی لە شەڕدا لەگەڵ براکەی دابوون، چوون لە گەڵی، ئەویش لە سنوری تورك بەرەو سنوری فارسی لەگەڵ خۆیدا بردن، (نەزەرا)ی تورکی شوێنیان کەوت، بەڵام کوردییە بەدەستی خۆی کوشتی، نامەی بۆ کوردی برای نارد و لای پەروێز داوای پاراستنی گیانی کرد، پاشان مێردی بە پەروێز کرد)[٢٩].

## گرتنی کوردستان:

لەگەڵ گرتنی ئیسلامی بۆ کوردستان، پەڕەیەکی تازە کرایەوە، سەردەمێکی تازە دەستی پێکرد، هەموو لایەنەکانی ژیانیی و ئاینیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و شارستانیی گرتەوە، ئاینی ئیسلام لەناو پێڕەکانی کۆمەڵگادا تەشەنەی کرد.

بەر لە ئیسلام، خەڵکی کوردستان لەسەر ئاینی زەردەشت پێغەمبەر بوون، لە ڕووی ئیدارە و هەڵسوڕان، کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی ساسانییەکاندا بوو، بەشێکی کەمی خۆرئاوا لەژێر ڕکێفی ڕۆمانیدا دەژیان.

### ۱-گرتنی (حەلوان) (۱٦ك/ ٦۳۷ز):

دوای گرتنی بوهرسیر[۳۰]، (یەزگورد) خێزانەکەی بردە حەلوان [۳۱]، پاشان ویستی پێیان بگاتو (مهران الرازی) لە (نەهرەوان) [۳۲] لە شوێنی خۆی دانا، بەڵام خۆی ڕانەگرت و بەرەو (جەلەولا)[۳۳] ڕای کرد، لەبەر ئەوەی ئامانجی دواتری موسڵمانان گرتنی جەلەولا بوو، چونکە (مهران) و لەشکرەکەی چاك خۆی قایم کردبوو، لە دەوریداو سەنگەرو خەندەکییان لێدابوو، خێزانیان بەرەو چیاکان ڕەوانە کرد، ساسانیان تاودایە، دەردەکەوێ، کە چیانشینەکان لەگەڵ لەشکری ئەودا بەشدارییان کردووە بۆ بەرگریکردن لە شارەکە و بەرەنگار بوونەوەی موسڵمانان، بەڵام ئەم بەرگرییە بێ هودە بوو، کەوتە ژێر دەستی موسڵمانان و ساڵی (۱٦ك/ ٦۳۷ز) گیرا [۳٤].

لە سەرووی ئەمەشەوە، ڕێکەوتنێکی تەواو هەیە لە مێژوونووساندا لە ڕاست گرتنی (جەلەولا)دا، لە سەردەمی خەلیفە عومەردا (ڕەزای خوای لەسەر بێت) (١٣-٢٣ك/ ٦٣٤-٦٤٣ز) گیراوە، بەڵام ناکۆکی لەوەدا یە: ئایا سەر لەشکرەکەی ناوی چی بووە؟ لەکام ساڵدا گیراوە؟ ئایا بە ڕێککەوتن و ئاشتی گیراوە، یان بەزۆر؟

(الطبري) باسی کردووە، ئەو سەرکردە دلێرەی ڕووی کردۆتە حەلوان (هاشم بن عتبە) بووە، بەڵام (جریر بن عبدالله البجلی) لە (ت ٥١ك/ ٦٧١ز) دا دەیگرێت. هەیە پێیوایە سەرکردەکە (سعد بن وقاص) بووە.

(جریر بن عبدالله البجلی) لە (١٦ك/ ٦٣٧) دا ڕەوانە دەکات و بە ناچارکردن دەیگرێت[٣٦].

گروپی سێیەمی مێژوونووسان پێیان وایە، ئەو کەسەی سەرلەشکری گرتنی حەلوانی کردووە، دوای جەلەولا و بە فەرمانی (هاشم بن عتبە) بریتی دەبێت لە (القعقاع بن عمرو) لە ساڵی (١٦ك/ ٦٣٧)دا دەیگرێت[٣٧].

بەڵام ئەم ڕایە بە ڕاستتر دەزانین، کە دەڵێ: گرتنی حەلوان لەسەر دەستی (القعقاع بن عمرو) ڕوودەدات ، لە ساڵی (١٦ك/ ٦٣٧ز) دا. چونکە ئەم گێڕانەوەیەی کە (الطبري) باسی دەکات، باسی ئەم لە شکرکێشی یەکراوە لە خەلیفە عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت)، کە (القعقاع) بۆ سەر لەشکریی هەڵدەبژێرێ ، گێڕانەوەی تریش هەیە بە ئیسنادەوە ئیسپاتی ئەمە دەکات.

بە دوای گرتنی حەلواندا، یەکەم پەیوەندی لە نێوان موسڵمانان و کورددا سەرییهەڵدا[٣٨].

پاشان (القعقاع) هەڵسا عەجەمەکانی لەناودا نیشتەجێکردن بەناوی (الحمداء)(قباذ)ی لەسەر حەلوان کردە والی خۆی، کە خەڵکی خوراسان بوو[٣٩].

## ٢-گرتنی (ماسبذان) (١٦ك/ ٦٣٧ز)[٤٠].

له کاتێکدا (سعد) له (المدائن)دا نیشتەجێ ببوو، (هاشم بن عتبە) هەواڵی دایه دەست (اذین بن الهرمزان) یەکێکە لە کەڵە پیاوانی فارسی، سوپایەکی گەورەی گردکردۆتەوە و بەرەو دەشتایی (ماسبذان)ی کێشاوە، هەواڵەکە گەیشتەوە عومەری کوڕی خەتتاب، کاتێ بەو هەواڵەی زانی، گورج (ضرار بن الخطاب)ی نارده سەریان بەرەو (ماسبذان)، کەوتە ڕێگا، جەنگێکی خەست له (بهندف) دا له دەشتایی (ماسبذان)دا ڕوویدا، موسڵمانان تێیدا سەرکەوتن، (اذین) گیراو بەهۆی موسڵمان نەبوون دەکوژرێت و سوپاکەشی ڕادەکات و بە چیاو دۆڵ و نشێوەکاندا بڵاو دەبنەوەو موسڵمانان شوێن ئەوانە کەوتن، که ڕایان کردبوو له جەنگ ڕزگاریان بوو، تا دەگەنە شاری (سیروان)[٤٢]. (ماسبذان) به زۆری دەگرن و خەڵکی شار بە دەوری چیا و کێوان دەبن، ئینجا بانگەشەیان دەکات، ئەوانیش وەڵامی دەدەنەوە، (ضرار) هەڵدەستێ (ابن الهذیل) دەکاتە جێنشین و (ماسبذان) دەبێتە بنکەیەکی گرنگ بۆ بەرگریکردن له (کوفه)[٤٣].

(الطبري) بەو بڕە هەواڵە کۆتایی بە گرتنی (ماسبذان) دێنێت.

## ٣-گرتنی (جەزیرە) (١٧ك/ ٦٣٨ز):

زۆرینەی کورد له جەزیرە موسڵمان بوون، ئەوانیش وەکو گەلانی ئەو ناوچەیە له ڕێگای گرتنی ئیسلامی بۆ ناوچەکە موسڵمان دەبن، لەسەر دەستی سەر لەشکر (عیاض بن غنم) [٤٤] له سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتابدا (ڕەزای خوای لەسەر بێت) دێتە دی[٤٥].

(الطبري) پێیوایه گرتنی جەزیره بەهۆی سوپای ئیسلامییەوه لە عێراق ڕوودەدات و گرتنی بەشێکه لە بەشەکانی تری گرتنی عێراق، بەڵام مێژوونووسی تر گرتنی جەزیره دەخەنە بازنەی لەشکرکێشیەکان بۆ سەر شام[٤٦].

(الطبري) گێڕاویەتییەوە، کە هۆکاری گرتنی (جەزیره) بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کوردەکان داوا لە شای (ڕۆم) دەکەن، لەشکر ڕەوانەی (شام) بکات، پەیمانی پێ دەدەن، ئەگەر گەمارۆی (ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح) و لەشکری موسڵمانان بدەن لە شامدا، ئەوان یاریدە و کۆمەکیان پێشکەش دەکەن[٤٧].

(عومەری کوڕی خەتتاب) بە هەڵوێستی خەڵکی (جەزیره)ی زانی، نامەی بۆ (سەعد) نارد و فەرمانی پێکرد لەگەڵ (عبدالله بن عتاب) بەرەو (نصيبين)[٤٨] بڕوات، کاتێ هەواڵی گەشبینی لەشکری ئیسلامی گەیشتە جەزیرەییەکان بۆ وڵاتی خۆیان گەڕانەوە، (عیاض بن غنم) ئاگربەست و ئاشتی لەگەڵ نواندن، ئەوانە خۆیان خستە عودەی موسڵمانانەوە، پاشان (عیاض بن سهیل بن عدي) و (عبدالله بن عتبان) ڕوویان لە (الرها)[٤٩] و (ئورفه) کرد، خەڵکەکە بە سەرانە (الجزیه)[٥٠] ڕازی بوون، دوای جەزیره (ابو موسی الاشعری) نارده (نصيبين) و خۆی گەیاندە (دارا)[٥٧] توانای دوای گرتنی (نصيبين) ئەوێش کۆنترۆڵ بکات.

(الطبري) لە بارەی گرتنی جەزیره دوو گێڕانەوە لە (سیف بن عمر) (١٧ك/٦٣٩ز) دەگێڕێتەوە، دیسان لە (ابن اسحاق) ساڵی (١٩ك/ ٦٤٠ز) (ابو اسحاق) باس دەکات: (جەزیره) لەلایەن یەکێ لەو سێ یانە گیراوە: (خالد بن عرفطة) یان (هاشم بن عتبه) یان (عیاض بن غنم)، لە کاتێکدا (عومەر) نامە بۆ (سعد بن ابی وقاص) دەنوسێ، (عیاض) دەڕواتە (الرها) ، لەسەر سەرانە دانوساندن لەگەڵ دانیشتوانیدا ئەنجام دەدات، دوایی (ابی موسی الاشعری) بۆ (نصيبين) ڕەوانە دەکات.

بەڵام لە گێڕانەوەی (سیف) دا (عیاض بن غنم) بە شوێن (القعقاع) دا دەڕوات، لەکاتێکداعومەری فاروق نامە بۆ سەعد کوڕی وەقاص دەنێرێ، تاوەکو کۆمەکی (ابن عبیده الجراح) بکات، لە (حمص)[٥٢]وە بۆ (الروم) بڕوات. ئەوان ڕێگای (جەزیرە) [٥٣] دەگرنە بەر، (الطبري) بڕوای وایە (جزیرە) لە هەموو وڵاتان ئاسانتر خۆبەدەستەوە دەدات، لەکاتێکداشام و عێراق چوونە ناو ئیسلامەوە[٥٤].

## ٤-گرتنی (مهرجان قذف)[٥٥].

مێژووی (مهرجان قذف) و گرتنی پەیوەندییەکی توندی بە کەسایەتی (هورمزان)ەوە هەیە، چونکە خەڵکی ئەوێ بووە، کاتێ لە شەڕی (قادسیە) سەرنەکەوت لە ساڵی (١٤ك/٦٣٥ز)دا بۆزێدی خۆی گەڕایەوە و پادشایەتی (مهرجان قذف)ی کرد[٥٦].

(الطبري) باس دەکات کاتێ موسڵمانان گەیشتنە (ئەهواز - خوزستان)، هەڕەشەیان بۆ بنکەی (هورمزان) پەیدا کرد، دوا جار زانی لە توانایدا نییە بەرەنگاریان بێتەوە، بۆیە داوای دانووستاندنی کرد، چونکە (هورمزان) لای خەڵکی پایە بەرز و بە شکۆ بوو، لەسەر داخوازی ئەو هاودەنگ بوون، لەسەر (مهرجان قذف) و (کوری ئەهواز بڕیاریاندا)[٥٧].

پێدەچێ هورمزان لە ڕوونکردنەوەی هەڵوێستەکانی (عتبە) بە هەڵە چووبێ و، بە نیشانەی لاوازی هەڵوێستی موسڵمانانی دانابێ، بۆیە بە پەلە پەیمانەکەی شکاندو پەنای بردە بەر کوردەکان، سوپایەکەی چڕ و قەرەباڵغتری کرد، بۆیە خەلیفە عومەر داوای لە (عتبە) کرد بەرەو هورمزان لەشکرکێشی بکات، بە سوپایەك کۆمەکی کرد (حرقوص بن زهیر السعدی) سەر لەشکری بکات، ئەو هاوڕێی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) بوو، کاتێ بەرەو هورمزان چوو،

هورمزان شکا، ئەنجا بەرەو (ڕامهرمز) ڕۆیشت[٥٩]. (حرقوص) کوڕی ئەهوازی گرت لەوێدا مایەوە، چووە (الجبل)، دیسان هورمزان داوای دانووستاندنی کردەوە، لەسەر ئەو دەسەڵاتەیە مایەوە، کە لە ژێر دەستی دابوو، لەوانە (مهرجان قذف) لە ژێر کۆنترۆلی دابوو، ئەو جارە هورمزان لەسەر ئەم ئاشتەواییە دەوامیدا، بە مەرجەکانی ئاگربەستەکە ڕازی بوو، سەرانەی دەدا، ئەگەرچی کوردانی فارس ناپاکییان لەگەڵدا کرد، یارمەتیان داو بەرگرییان لێکرد.

دوای مردنی (عتبە بن غزوان) جەنابی (اباسیرە بن ابی زهم) کرا بە سەرلەشکری موسڵمانان، فەرمانبەرانی (عتبە) لەشوێنی خۆیاندا مانەوە، بەڵام زۆری نەخایاند (هورمزان) پەیمانەکەی هەڵوەشاندنەوە، (یەزگورد)[٦٠] هانی دا، کە هەمیشە خەڵکی زێدی ئەوی هاندەدا، لە هەرێمەکەوە کۆمەکی سەربازی گەیشت[٦١]. سەربازی فارس لە شاری (تۆستەر)[٦٢] دابەزین، بۆیە موسڵمانان لەگەڵیدا کەوتنە شەڕ لە خەڵکی فارس و خەڵکی (الجبال)، هورمزان جەنگەکەی نەبردەوە و بەرەو (تستر) ڕایکرد، ئەوێ بووە پێگەی دوایی لایەنگیرانیو کۆمەك و یارمەتی تری سەربازی پێ گەیشت، بەڵام بێ سوود بوو، (تستر) گیرا و ئەویش خۆی بەدەستەوە داو، بەرەو لای عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) برا لە مەدینەدا.

### ٥-گرتنی (نەهاوەند):

سەرباری ئەو زەبرانەی لە جەنگەکانی ڕابردوودا بەر (کیسرا) کەوتن، هیوا بڕاو نەبوو لە گێڕانەوەی دەسەڵاتیدا، بۆیە دەستیکرد بە نامە ناردن و گردبوونەوەی خەڵك، لە ئەنجامدا خەڵکێکی زۆری بە دەنگەوە چوو لەو شارو شارەکانی ترو کورەکانی تردا، سووربوونی خۆیان دەرخست بۆ بەرەنگاربوونەوە، (یەزگورد) هانی دەدان، زۆربەی خەڵکی فارس نامەیان بۆ یەکتریی نووسی، ئەو وڵاتانەی موسڵمانان

گرتبوونیان، دەستیان بە ڕاپەڕین و شۆڕش کرد، وەکو (قرماسین)[٦٥] (کرمانشاه) و (ماسبذان). ژوانگەی ئەوان لە (نەهاوەند) بوو سووربوون لەسەر شاربەردەر کردنی موسڵمانان لە وڵاتدا [٦٦].

لەبەر ئەوە موسڵمانان ئامادەییان دەربڕی و کەوتنەخۆ، عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) هەڵسا (النعمان بن مقرن)ی کاندید کرد بۆ سەرلەشکری، عومەر ڕێکی سوپای لە یاد نەخست، بۆیە نامەی بۆ (النعمان) نارد، گەر تۆ تووشی هەر کارەساتێك هاتی (حذیفة بن یمان) هەڵبژێرە، گەر ئەو تووشی هەر ڕووداوێك بوو با (نعیم بن مقرن) [٦٧]. لەلایەن خەڵکەوە بکرێتەسەر لەشکر.

دانانی ئەو ژمارە زۆرەی سەحابە و سەرلەشکرەکان بۆ ئەوەیە، گەر یەکێ لەوانە کوژرا، کێشە نەکەوێتە ناو سوپا لە هەڵبژاردنی سوپا سالاریدا[٦٨].

موسڵمانان توانیان زیان و شکاندن تووشی فارسەکان بکەن و بەسەریاندا سەربکەون، بۆیە پاشماوەی فارسەکان بۆ (هەمەدان) ڕایان کرد و موسڵمانانیش چوونە ناو شاری (نەهاوەند)ەوە.

دەسەڵاتی گرتنی موسڵمانان بەسەر (نەهاوەند)دا، خاڵێکی یەکلاکەرەوە بوو لە ڕێڕەوی کرداری فراوانخوازیدا لەلایەکەوەو، لەلایەکی ترەوە دەوڵەتی (ساسانی) لەبەر ئەوە نامۆ نییە کە بە سەرچاوەی گرتنەکان ناوببرێت[٦٩].

کلیلی سەرکەوتنی یەکلاکەرەوە بوو بەسەر سوپای (ساسانی) دا، چونکە بڕبڕەی پشتی شکاند و نەیتوانی جارەکی تر هەڵبسێتەوە بە بەرگرییەکی ڕێك بەرهەڵستی موسڵمانان بکات، نەیتوانی خۆی ڕێك بخاتەوە، دیسان سوپای ساسانی سەرکردەیی یەکگرتوو و پلانی کێشراوی لەدەست دا بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی موسڵمانان، ئەم جەنگە بە مۆرکی کۆتایی مێژووی موسڵمانان دادەنرێ بۆ وڵاتی

فارس[٧٠]. توانایان لەدەست داو دەسەلاتیان بە تەواوی لە گۆڕەپانی سیاسی و سەربازیدا کۆتایی هات.

لە ڕووی مەعنەوییەوە هیواکانی (یەزگورد) و گەورە پیاوانی ولاتەکەی لە گێڕانەوەی شکۆیاندا سەریان نەگرت، نەیانتوانی هێزەکی تەواو کۆبکەنەوە و ئامادەی بکەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی موسڵمانان، لەبەر ئەوە (دینور)[٧٢] و (ماسبذان) و (سیروان) کەوتە بەر دەست موسڵمانان و دوایی موسڵمانان شار بەشاری ژێر دەستی ساسانیەکانیان کەوتە ژێر ڕکێفەوە.

## ٦-گرتنی (هەمەذان):

دەرگاکانی ساسانی تر لەبەردەم موسڵماناندا گیران ، لە ڕاست چۆنیەتی ئەم گرتنە، لە ناو موسڵماناندا ناکۆکی هەیە، ئایا بە ئاشتی بووە، یان بە زەبر و زۆری، دیسان لە ڕاست ناوی سەرلەشکرەکەو ساڵی گرتنەکە ناکۆکیان هەیە؟

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە: (حوزەیفە لە ساڵی ٢٢ك/ ٦٤٣ز) دا بە ناچار کردن گرتوویەتی). لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: (موغیرەی کوڕی شوعبە لە ٢٤ك/ ٦٤٤ز) دا دەیگرێ، گێڕانەوەیەکی تردەڵێ: (موغیرە لە کۆتایی ساڵی (٢٣ك/ ٦٤٣ز)دا بە ئاشتی گرتویەتی. وتراوە موغیرە خۆی دەبێ بە والی ئەوێ، گومانی تێدا نییە دوای (نەهاوەند) گیراوە، پاش ئەوەی (هورمزان) بۆ (نەهاوەند) دەڕوات و موسڵمانان شوێنیان دەکەون[٧٣]. بۆیە (خروشنوم) داوای پەناهەندەیی کرد، بەو مەرجەی (همدان) و(ستبس)یان بۆ زامن بکات، ئەوانیش بەگوێیان کرد، ئەوەش لە ساڵی ٢١ك/ ٦٤١ز) دا هاتە ئاراوە.

بڕوای وایە گرتنی هەمەدان (٢١ك/ ٦٤١ز) بووە، ڕاستەوخۆ دوای گرتنی (نەهاوند) بووە، (الطبري) چەند گێڕانەوەیەك لەو بارەوە دەهێنێتەوە، چونکە بەشێك لە پاشماوەکانی سوپای ساسانی ڕووی تێدەکات، لەوانەیە بەشی هەرە

زۆرینــه بوویێــت، چــونکه ســەرکردە (فــیروزان) لەگەڵیانــدا دەبێــت، کــه لەوێــدا دەکوژرێت، بەڵام دەشێ موسڵمانان هەلی ئاوا نەقۆزنەوەو لە دەستی بدەن؟ پێدەچێ خەڵکی شار لەسەر بەڵێنەکەیان نەمابنەوە، بۆیە عومەری کـوڕی خـەتتاب (ڕەزای خوای لێبێ) (نعـیم بـن مقـرن) دەنێـرێ و دەسـتور دەدات، تـا دواوەی (همـذان) بگرێ، ئەوان گەمارۆی شارەکەیانداو بە تـەواوی گرتییـان، بۆیـە دانیشـتوان داوای ئاگر بەستیان کردەوەو بە (سەرانە) دان قایل بوون[٧٤].

پێدەچێ لەبەر ئەوە پەیمانیان شکاندبێ تازە موسڵمان بوون و بەدەنگ چوونییان بۆ یاخی بوون و تـێ هەڵچـونەوەیان زیـاتر بـووبێ، دوور نییـە لەبەرئـەوە بـووبێ دەوڵەتی ئـەوان دەڕواتـە نـاو بازنـەی سـنووری وڵاتـی ئیسـلامییەوە و، هـەواڵی کۆبوونەوەی ساسانییەکان لەناوچەی (الری) یان پێگەیشتبێت[٧٥].

بەڵام ئـەو گێڕانەوانـەی سـاڵانی (١٧ ك/٦٣٨ز/ و (١٨ ك/ ٦٣٩ز)و (١٩ ك/ ٦٤٠ز)[٧٦] دیاری دەکەن لاوازن، چونکە (همدان) دوای گرتنی (نەهاوەند) دەگیرێ، ڕێیتێ ناچێ موسڵمانان (همدانییان) گرتبێ، کە دەکەوێتە دواوەی (نەهاوەنـد)ەوە، مەسەلەی گردبوونەوەی سوپای ساسانی لە (نەهاوەند) پشت گوێ بخەن، لەکاتێکـدا گرتنی نەهاوەند لەساڵی (٢١ ك/ ٦٤١م) بووە.

لێرەدا گێڕانەوە هەیە گرتنی (هەمەدان) بۆ ساڵانی (٢٢ ك/ ٦٤٣ز)[٧٧] و (٢٣ ك/ ٦٤٣ز)[٧٨] و (٢٤ ك/ ٦٤٤ز) دوا دەخـات، کـە بەڕاسـت دانانرێن،چـونکە (هەمەدان) نزیك (نهاوەند)ە، دیسان سوپای ساسانی لەشـەڕی (نهاوەنـد)دا بـڕاوە نابن بەسەرکردایەتی (فەیروزان) بۆ (هەمەدان) دەکشێنەوە.

### ٧-گرتنی (دەینور).

دوای(هەمەدان)و گرتنی (حلوان) ساڵی (١٦ك/ ٦٣٧ز) هێرش کرایە سەر (الدینور)، بەڵام سەرنەکەوت، دوورنییە لەبەرئەوە بوویێ، لەلایەکەوە قایم کرابێ، موسڵمانان سەرقاڵی گرتنی شوێنی تربووبن، لەلایەکی ترەوە کێ سەرلەشکری ئەم کردارە بووە، مێژوونووسان ڕای جیاوازیان هەیە.

(البلاذري) باس دەکات (ابا موسی الاشعری) بووە، دەینور دەگرێ، پاش ئەوەی (نهاوند)[٨٠] دەگیرێت، هەرچی (ابو الفداء)ە، پێی وایە (حذیفة بن الیمان) شاری (الدینور) بە تۆبزی دەگرێت[٨١] بەڵام ڕای یەکەم ڕاسترە، چونکە (البلاذري) لەو مێژوونووسانەیە،کە پسپۆڕ بێ لە گرتنی ئیسلامیدا، لە (ابو الفداء) کۆنترە، دیسان کۆمەڵێ مێژوونووس لەم بۆچوونەدا پشتی دەگرن.

# باسی سێیەم

## کورد لەسێبەری حوکمی ئومەویدا (٤١-١٣٢ ک/ ٦٦١-٧٤٩ز):

### ئەو بزووتنەوانەی کورد بەشداری تێدا دەکات دژ بە دەوڵەتی ئومەوی:

### ١-بزووتنەوەی خەواریجەکان:

کورد بەشدارییەکی گەورەی تێدا کرد، شکۆیان لەڕاست ئەوەدا بەرز بۆوە، حاڵەتی ئەوانیش هەمان حاڵەتی ئەو گەل و گروپانە بوو لەدەوڵەتی ئومەویدا لەدژی ئەو دەوڵەتەدا نارەزایی پشان دەدەن و ڕادەپەڕن، بەشداری خەواریجەکان دەکەن دژ بەدەوڵەتی ئومەوییەکان، (المسعودي، باس دەکات (هەبوو لە کوردەکان بیرو بڕوای خەواریجی قبوولّ کردبوو خۆیان لە عوسمان و عەلی بەری کردبوو).

ئەم دەقەش دەریدەخات چەندە بیری خەواریج لەناو کوردا دا تەشەنەی کردبوو.

پەیوەندی هەندێ لە کوردەکان بە خەواریجەکانەوە بۆ سەرەتای سەرهەڵدانییان دەگەڕێتەوە، کاتێ ڕیزی سوپای ئیمام عەلی (علیه السلام) بەجێ دێڵن و (عبدالله بن وهب الراسی) پێیان دەڵێ: (لەم شارە بچنە دەر، کە ستەمکاریی تێدا دەکرێ لەگەڵ خەڵکیدا بۆناو کورەکانی چیاکان و هەندێ لەوشارانە[٨٣].

چونکە چیاکان بەسەنگەرو پەناگایەکی بێ ترس دادەنێن بۆ پاراستنی ئەوان لە زۆرداری ئومەوییەکاندا [٨٤].

بەشێکی تر لە بزووتنەوەی خەواریجەکان، کە کورد بەشداری تێدا کـردووە، بـەو مانایەی ئەوانیان کردۆتە پەناگای بزووتنەوەکانییان، ئەم بزووتنەوانەن:

## أ-بزووتنەوەی (نوفل بن فروه الاشجعی):

(فروه) هەر لەسەرەتاوە یـەکێ بـوو لەسـەرکردەکانی خـەواریج ، دوای ئـەوەی وشەی خەواریج بلاوەی کرد، (فروه) لە (عبـدالله بـن وهـب الراسـی) جیـا بـۆوە، بەسەرکردایەتی (٥٠٠) خەواریج ڕووی لە ناوچەی (بەنـدنجین-مەنـدەلی)[٨٥] کـرد، (فروه) تادەگاتە سالی (٤١ ك/ ٦٦٥ز) سـەرکردەی پێـڕی خـەواریجی کـردن، ئـەو لەهەرێمەکانی (ئیقلیمی جیبال)[٨٦] و (شارەزوور)[٨٧]دا هاتووچۆی دەکـرد، کـاتێ (موعاویيـەی کـوڕی ئەبوسـوفیان دەسـەلاتی وەرگـرت لەسـالی (٤١ ك/٦٦١ز)، (فروه) و یارانی ڕێگای شاری (کوفـە)یان گرتەبـەر، دوای ئـەوەی ڕەوەنـدەکانییان نیشتەجێ بوون لەدەوری ئەوێ، لەچوونە نـاو شـارەکەدا سـەرکەوتن، دوای ئـەوەی زنجیرەیەك جەنگی خەستییان لەگـەڵ سـوپای ئومەویـدا ئەنجامـدا، بـەلام (فـروه) سەرەنجام کوژرا، دوای ئەوەی بەشێکی لەشانی دەولـەتی ئومـەوی شـەکەت کـرد، کۆتاییی بەشەڕەکە هات)[٨٨].

## ب-بزووتنەوەی (حیان بن ضبیان السلمي) لە (٥٨ ك/ ٦٧٧ز)دا:

(حیان) دژی دەسەلاتی (معاویه) دەرچوو، ڕووی کردە چەقی شـاری (حلـوان)، کەچی دەسەلاتی ئومەوی تـوانی ئـەم بزووتنەوەیـە لـەناوی ببـات و بیبڕێنێتـەوە، لەکاتێدا تازە سەری هەلدەدا، ئەم دەولـەت بەوەنـدە نەگیرسـایەوە، بـەلکو سـەری لەشکرەکەی لەشاری (کوفە)دا کوشت و جەنگەکـە کۆتـایی هـات ، بزووتنەوەکـە بڕایەوە و تاقەواری نەما، بۆ زانین (الطبري) تاك لایەنە ئاماژەی بەسەرهەلدانی ئەم بزووتنەوەیە کردووە[٨٩].

## ج-بزووتنەوەی (شبیب بن یزید الخارجی) لە (٧٦ ك/ ٦٩٥ز)دا:

(شبیب) یەکێ بوو لە لایەنگرانی (صالح بـن مسـرح التمیمـی) دوای کـوژرانی (صالح) لەساڵی (٧٦ ك/ ٦٩٥ز)دا لایەنگرانی سووربوون لە درێـژەدان بـە خـەباتی نەپساوەی ئەو بۆ هێنانەدی ئامانجەکان، لەبەرئەوە (شبیب) بە سەرلەشـکر کاندیـد دەکەن[٩٠]، ئەویش وەکو سەرلەشـکری تـری خـەواریج (ئیقلیمـی جیبـال) دەکاتـە پێگەی چالاکییەکانی خۆی و بزووتنەوەکەی، کاتێ کارەکـانی جێگیربـوون دەسـتی کـردە پـەلاماردانی مەڵبەنـدەکانی سـوڵتەی ئومـەوی و دامودەزگاکانییـان، بەمەبەستی گۆت کردنی بزووتنەوەکەی و زەفەر پێبردنی، بـەپێی گێڕانـەوەی (ابـن الاثـیر) کە بەڕاست دادەندرێ، ئەو دەتوانێ دڵی کەسانێکی زۆری (ئیقلیمی جەبەل) ڕابکێشـێ، نـەخوازەلا لەشـاری (حلـوان) و دەوروبـەری و بیانخزێنێتـە نـاو بزووتنەوەکەی، بەڵام (حجاج بـن یوسـف) والـی عێـراق لەوکاتـەدا بـەپێی پلانـی تایبەتی خۆی، توانی بەر لەگەورەبوونی ئەم بزووتنەوەیە و دژواربوونی لە دەسەڵات بەسـەردا شـکانی لـەناوی ببـات و بیـان تاوێنێتـەوە، کـاتێ هێشـتا چـەکەرەیان نەکردبوو، هەر لە بێشکە دابوون و ڕووناکی یان نەکەوتبووە بەرچاوان[٩١].

## د-(بزووتنەوەی (مطرف بن مغیرة بن شعبة) (٧٧ ك/ ٦٩٦ز):

(مطرف بن مغیرة) لەدژی (حجاج) و (عبدالملك بن مروان) (ت ٨٦ ك/ ٧٠٥ز) ڕاپەڕی، بزووتنەوەکەی پەرەی سـەندو پـاڵی دایـە چـیاکان، لەماوەیـەکی کەمـدا دەسەڵاتی بەسەر زۆر ناوچەدا فراوانکـرد، چـونکە دەسـەڵاتی ئومەوییـەکان لـەو ناوچانەدا پتەو نەبووە، سەرباری گیروگرفتیی باری سیاسی و ناوخۆ لەلایەکەوە، بێ سەروبەری و نەبوونی یاسـاو ئـاژاوەی ئێـرەو ئـەوێی داگرتبـوو، لەلایـەکی تـریش بزووتنەوەی بەر هەڵستکاران و ئۆپۆزسیۆنەکان سەریان هەڵدابوو.

(مطرف) سەرەتا خۆی والی (حەجاج) بوو لە (المدائن)، بەڵام روانینی (مطرف) و (شبیب بن یزید الخارجی) دژی سیاسەتی توندوتیژی حەجاج لەراست خەڵکی و مەوالیەکاندا، کە لێی بێزار بووبوون، لێك نزیك دەبێتەوە[92].

دۆستو لایەنگرانی بانگەشە دەکات خەلیفە (عبدالملك) و (حەجاج)ی والی لەعێراقدا لەسەر کار لابەن، بانگەشە بۆ پیادەکردنی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) بکرێ، کاروبارەکان بە (ڕاوێژ و شورا)ی موسڵمانان بەڕێوە بچێ، وەك لەدەقی قورئاندا هاتووە:﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾[93].

چەند ڕۆژێك ڕۆریشت (مطرف) و دەست و پەیوەندییەکانی ڕوویان لە (حلوان) و (چیاکان) کرد، ئەمەش نەریتی هەموو سەرکردەکانی خەواریجەکان بوو لەچاخی ئومەویدا، دەیزانی کاتێ سەرکەوتن یاوەری دەبێ، کە (المدائن) بەجێ بێڵێ و ڕوو لە هەرێمەکی بێ ترس وبێ باك بکات، سەنگەرو پەناگەو شوێنی خۆحەشاردانی سروشتی زۆر بێ، دوژمن بەئاسانی دەستی پێیان نەکات و پێی نەگیرێت، جگە لەمەش ئەو ناوچەیە دوور بوو لە دەستی دەسەڵاتدارانی ئومەوی، بۆیە بەرەو (حەلوان) کەوتەڕێ، سەرکاری ئەو ناوچەیەی حەجاج (سوید بن عبدالرحمان) بوو، (سوید) هەوڵیدا پێشی پێ بگرێ و بێتە ناو شارەوە، ژمارەیەك لە حەلوان و دەروبەری یارمەتییان بۆ ئەوەدا، بۆیە (مطرف) ناچار بوو شەڕ لەگەڵ کورد بکات و زیانەکی زۆریان پێ بگەیەنێت و ژمارەیەکی زۆریان لێ بکوژێت، ڕۆیشتن تا گەیشتنە (همدان)، (همزە بن مغیرە)ی برای والی بوو بەسەر (همدان)دا، پاشان، (مطرف) ڕێڕەوی سوپا گەورەکەی بەرەو (ماە دینار-دەینور) گۆڕی، نامەی بۆ (هەمزە)ی برای نووسی، بارودۆخی خۆی تێدا باسکرد، داوای یارمەتی و کۆمەکی لێکرد، ئەویش دوای چەند ڕۆژێکی کەم، چەك و تفاقی شەڕو دارایی بەنهێنییەوە

بۆ ئاودیو کرد، زۆری نـەبرد (مطـرف) کاربەدەسـت و جێگرەوانـی خـۆی بـۆ ئـەو ناوچانە نارد، (الری) و (اصفهان)[٩٤] و (قوم)[٩٥].

خەڵکی دەستە دەستە دەهاتن و دەخزانە بزووتنەوەکەیەوە، لەوانەش (بکـر بـن ماهان) لە (الری)، بـەڵام (حـەجاج) تـوانی (همـزە) دەسـتگیر بکـات و ڕاپێچـی زیندانی بکات، دەست بەجێ (قیس بـن سـعد)ی لەشـوێنی ئـەودانا، کـە سـەرۆك پۆلیسی (همدان) بوو، (حەجاج) بەوکارە شادی خۆی پیشاندا، تا دەست بەتاڵ ببێ بۆ شەڕکردن لەگەڵ (مطرف) دا بەتەنیا[٩٦].

سەیر نییە، (حەجاج) لە سەرکوتکردنی بزووتنەوە بەرهەڵسـتکارەکان سـنووری بەزاند بەنواندنی ئەو هێزو توندو تیژییەوە، هـەر لەسـەرەتاوە سـەرباری وەلائـی و دڵسۆزی ڕەهای بۆ خەلیفە (عبدالملك بن مـروان) ، لەگـەل سـووربوونی پێشـینەی لەسەر تێك شکاندنی هەر بزووتنەوەیەکی دژ بە سوڵتەی ئومـەوی لێـرەو لەوێـدا، لەبەر بوونی شوێنی عاسێ و چیای سەرکەش، دوور نییـە بزووتنـەوەی (مطـرف) و خۆی، ماوەیەکی درێژ دەوام بکەن، چونکە دژوارە، سوپای ئومەوی بیانبڕێت، نـابێ لەیادمان بچێ دەبێ ئاماژە بە بوونی نوێنەرانی هۆزو خێزانە عەرەبیـەکان بکـەین لە (همدان) ، کە سەربە حەجاج و ئومەوییەکان بـوون، کـە لەوێـدا جـێگیر بـوون ڕۆڵێکی باڵادەبینن لە دامرکاندنەوەی بزووتنەوەکەدا، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ کـورد لە دەوروبـەری (حلـوان)دا پشـتگیرییان دەکـەن، هاوهەڵوێسـتییان پێشـان دەدەن، لەگـەڵ (سـوید بـن عبـدالرحمن) والـی (حلـوان)دا بـۆ پـەرچ دانـەوەی لەشـکرو پەلامارەکانی (مطرف)، دیسان (عـدی بـن وتـاد)، کـە بـۆ شـەڕکردن دێ لەگـەل (مطرف)دا بە (١٠٠٠) جەنگاوەر و خـەڵکی ئەصـفەهان و کـورد پشـتیگری لـێ دەکەن[٩٧].

زانیارییەکی تەواوو ڕۆشمان نییە تا کام ئاستە کوردو کەسانی تر لە دانیشتوانی چیاکان بەشدارییان لە بزووتنەوەی (مطرف)دا کردووە، چونکە سەرچاوە مێژووییەکان و ئەدەبییەکان بە تەواوی لەوبارەوە بێ دەنگ بوون و لەلایەن نووسەرەکانیانەوە هیچ شتێ باس نەکراوە.

گومانی تێدا نییە ئەوان بەشدارییەکی چالاکییان تێدا کرد، شاهیدی دەوریان بدات، تواناو هێزی جەنگییان چەند بوویێت، بێگومان ئەوانە جەنگاوەرو پێشمەرگەی بەهێز بوون و لەمردن سڵیان نەکردووەو لەناو دڵە ڕەقەکەیاندا مردن ڕێگایەکی نەبووە بڕواتە ناویانەوە، لەبەرئەوە ئەو بزووتنەوانە لەناو جەرگەی کوردستاندا سەریان هەڵداوە، بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی ئومەوی و دوژمنایەتی کردنی.

دیسان تێبینی دەکرێ کوردەکان و خەواریجەکان لەماوەکانی داهاتوودا بەرەو هێوریی و ئارامیی چوون، ماوەیەك چاوەڕێی هەڵوێستەکان و پەرەسەندنەکانیان کردووە، بەتایبەتی لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (٩٩ ك/ ١٠١ ك — ٧١٧ز/ ٧١٩ز)- ڕەزای خوای لێبێت -دا، چونکە پەیوەندی نێوان کوردو ئەو خۆش دەبێ، بەڵام بارودۆخەکە بەم شێوەیە نامێنێتەوە، سیاسەتی خەلیفەکانی ئومەوی کە دوای خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دێنە سەرکار، دەگۆڕێت[٩٨].

### ە-(سعید بن بجدل الشیبانی):

ئەم بزووتنەوەیە لە (شارەزور) سەری هەڵدا، بەڵام دەسەڵاتی ئومەوی بەزوویی دایمرکاندەوە، سەرلەشکرانی بزووتنەوەکە هەرگیز لەخەیاڵییان نەدەگەڕا، ئەم بزوتنەوەیە ئاوا خێرا سەرهەڵبدات و خێرا دامرکێتەوە و لەیەك کاتدا ڕووبدەن، بۆیە زانیاری زۆرمان لەڕاست ئەم بزوتنەوەیەدا نییە.

### و-بزووتنەوەی (الضحاك الخارجي):

زوحاکی خەواریج، (شارەزوور) دەکاتە مەڵبەندی بزووتنەوەکەی، دەگونجێ ژمارەی یاران و لایەنگرانی وردە وردە بەشێوەیەکی بەرچاو ڕوو لە زۆربووندا بێت، کاتێ بەخاکی (جەزیرە)دا ڕەت دەبێ، (٣٠٠٠) کەس لەدانیشتوانی جەنگاوەری دەخزێنە ناو سوپاکەیەوە[٩٩].

لێرەدا دەردەکەوێ خەواریجەکان سوود لە هەڵوێستی خەڵکی (جزیرە) وەردەگرن، بەتایبەتی دانیشتوانی (نەینەوا) یان (موسڵ)، (الطبري) ئاماژە دەکات زوو بەدەنگ جاڕدانەکەی (الضحاك) و خەواریجەکانەوە دەچن و دەرگای شار بۆ کوشتنی ئومەوییەکان دەخەنە سەر گازی پشت (١٠٠) لەبەر ئەوە (مەروان) داوا لە (عبداللە)ی کوڕی دەکات پەلە لەڕۆیشتن بکات بەرەو (نصیبین) تا (الضحاك) سەرقاڵ بکات لە جەزیرەدا چەق ببەستێ، دیارە ژمارەی ئەوانەی دێنە گەڵ خەواریجەکان لەوانە کورد دوای گرتنی (نەینەوا) و (کوردەکانی) زیاتر دەبێ، چونکە دەگاتە نزیکەی (٤٠٠) جەنگاوەر(١٠١).

لەمەوە ئاشکرا دەبێ خزانی کورد بۆناو بزووتنەوەکەی زوحاك، هێزو بازوویەکی گەورەی دەداتێ، (عبداللە بن مروان) هێزێکی جەنگاوەری نابێ،کە بەرهەڵستی (الضحاك) بکات، چونکە ئەو، توانایەکی تەواوی بەدەستەوە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە ناتوانێ زەفەری پێ ببات، زوحاك ناچار دەبێ بەرەو چیاکان پاشەکشە بکات، بەڵام ئومەوییەکان مەیدانی بۆ چۆڵ ناکەن، بەئارەزووی خۆی و بەرەو باکوور و باشوور تەراتێنی تێدا بکات، جەنگ هەوڵی بنەبڕکردنی بزووتنەوەکەی دەدەن، لەبەرئەوەی هەندێ هەل ومەرج دێتە پێشەوە، یارمەتی ئامانجەکەیان دەدات، لەسایەیدا بزووتنەوەی (الضحاك) کۆتایی دێت.

### ز-بزووتنەوەی (الشيبان بن عبدالعزيز الحروری الخارجی):

(شەيبان) سەرلەشكری بزووتنەوەيەكی خەواريجی فراوانی كرد لـەكۆتايی چـاخی ئومەویدا، كاتێ شەيبان سەرەتا لەياوەرانی (الضحاك الخارجی) بوو، كاتێ كـوژرا (الخيبری) جێی گرتەوە، زۆری نەبرد ئەويش كوژرا، دوای ئەو (الشـيبان) هەڵبـژێرار كە سەرلەشكری بزووتنەوەكە بكات.

نيشـتمانی بزووتنـەوەی (الشـيبان) دەوروبـەری نەينـەوا (موسـڵ) بـوو، دوای شكانی بەدەستی خەليفە (مروان بن محمـد) و نـەبونی شانسـی سـەركەوتنی ڕووی لەباشووری شاری (كوفە) كرد، زۆری پێ نەچوو (شيبان) گەيشتە وڵاتـی (فـارس و سجستان)(١٠٢)، تا لەساڵی (١٢٩) يان (١٣٠ك) بەرامبەر (٧٤٦-٧٤٧ز) كۆچـی دوايی كرد (١٠٣).

سەير نييە، كەيەكێ لە سەركردە ناودارەكانی خەواريجەكان نـاوی (منصـور بـن جمهور) بۆخۆی لە بزووتنەوەی (شيبان) دابڕی و ڕووی لـە هـەرێمی (الجبـال) كـرد، كاتێ گەيشتە جێ (الدينور) و (نهاوند) و تەواوی ناوچـەكانی (الجبـال)ی كـۆنترۆڵ كردن.

(منصور بن جمهـور) بەسـتمان و چـەك لەهـەرێمی (الجبـال)ەوە كۆمـەكی بـۆ (الشيبان) دەنارد بۆ يارمەتيدانی بزووتنەوەی(١٠٤)، بەڵام لێرەدا دەقێكی مێژوويی نييـە كـورد بەشـداری لـە بزووتنەوەكـەی (الشـيبان)دا كردبـێ، بـەڵام ئاسـاييە ژمارەيەك پياو خۆيان خزاندبێتە ناو بزووتنەوەكەی ئەو، چونكە وەكـو باسمـان كـرد ناوچـە كوردنشـينەكان دەكەنـە مەڵبەنـدی چـالاكييە دوژمنكارييـەكانيان دژ بـە خەلافەتی ئومەوی.

٢-كـوردو بەرهەڵسـتكارو ئۆپۆزسـيۆنەكان دژ بـە دەوڵـەتی ئومـەوی هـەر خەواريجەكان پێوەی هەڵنەستان، كە ژمارەيـەكی زۆر كـورد دەچـنە ريزەكانيانـەوە

وەکو ئێستا باسمان کرد، بەڵکو بزووتنەوەی تریش لەلایەنی ترەوە دەرکەوتبوون، بـۆ ڕیشـەکێش کردنـی دەوڵـەتی ئومـەوی کاریـان دەکـرد، لەگـەڵ بـوونی ئەوانـەی پاڵپشتییان بوون بۆ هێنانەدی مەبەستەکان.

کوردستان کەوتە ژێر کاریگەری ئەو بزووتنەوانەی کە دژ بە خەلافەتی ئومـەوی سەریان هەڵدا، لەوانە:

## أ-بزوتنەوەی (عبدالله بن الزبیر) (٦٤-٧٣ك/ ٦٨٣-٦٩٢ز):

هەندێ سەرچاوەی مێژوویی ئاماژە دەکەن (ابن الزبیر) لەتـەواوی مینبـەرەکانی جەزیرەو شارو وڵاتە ئیسلامییەکانەوە جاڕی بۆ دراوەو بانگەشەی بۆ کراوە(١٠٥).

سوڵتەی (ابن الزبیر) لە هەرێمەکانی خۆرهەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی تێدەپەڕێ و هەرێمی (چیا) لەخۆ دەگـرێ، والیـەکانی بـۆ شـارەکانی هەرێمـەکان دەنێـرێ بـۆ هەڵسوڕاندنیان، هاوکات (مصعب بن الزبیر)ی براکەی، بزوتنەوەی (المختار الثقفي) لەناو دەبات، کە دەسەڵاتی گرتبوو بەسەر تەواوی هەرێمی (الجبال)دا(١٠٦).

بەڵام (الطبري) لە دوورو نزیکەوە ئاماژە بۆئەو ناوچانە ناکات،کە (عبـدالله بـن الزبیر) دەستی بەسەردا شکاون، یان گەیشتبێتە هەرێمی (الجبال).

## ب-بزووتنەوەی (مختار بن یوسف الثقفي):

پاش سەرکەوتنی (المختار) بەسەر لەشکری ئومەوی‌دا بەسەرکردایەتی (ابـراهیم بن الاشتر)دا لەناوچەی (الخازر)دا، لەماوەیەکی کورتـدا، تـوانی دەسـەڵات بەسـەر ناوچـەکانی (ئـەرمینیا) و (ئازەربیجـان) و جـەزیرەدا بگـری ، والیـەکانی لـەو ناوچانەدا دیاری کردن.

فەرمانبەری ئەو لەسەر (حلوان) بریتی بوو لە (سعید بن حذیفة بـن الیمـان) بـۆ جەنگی ئەو کوردانەی ڕەوانە دەکات کۆنترۆڵیان کردبوو(١٠٧).

لێرەدا دەردەكەوێ كوردەكان ئەم هەلە دەقۆزنەوە دەسەڵات بەسەر ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی خۆیاندا دەگرن، (المختار)، نامە بۆ فەرمانبەرانی دەنێرێ بۆ (الجبال) سامانی (كورەكانییان) بۆ (سعید بن حذیفة بن الیمان) ڕەوانە بكەن، (ابن الاشتر) دەكاتە والی بەسەر (نەینەوا)دا، دیسان فەرمانبەرانی بۆ شارەكانی جزیرەش ڕەوانە دەكات (١٠٨).

## ج-بزووتنەوەی (ابراهیم بن مالك الاشتر):

ئیبراهیم یەكێ بوو لە گەورە پیاوانی شاری (كوفە)، زۆر شەیداو دڵسۆزی (ئال و بەیت) بووە، بۆیە بەمەبەستی تۆڵە سەندنەوە بۆ ئیمام (حوسێن) سەلامی خوای لێبێ دەچێتە ناو بزووتنەوەكە، پاشان خۆی جیادەكاتەوە و بزووتنەوەیەكی سیاسی بۆخۆی دروست دەكات و پێشەوایەتی دەكات، كە ناوچەكانی (نەینەوا) دەگرێتەوە (١٠٩).

## د- بزووتنەوەی (عبدالله بن الحر):

(عبدالله بن الحر) لەدژی (عبیدالله بن زیاد) والی (كوفە) دەرچوو، چونكە لەلایەن (عبدالله)وە تاوانبار دەكرێ، كەئەو پەیوەندی بە ئیمام (حوسێن كوڕی ئیمام عەلییەوە كردووە) سەلامی خوایان لێ بێت، لە هەرێمی (الجبال)ەوەو ڕوودەكاتە خەلیفەو دیاری خۆی لێوەردەگرێ، شان و شكۆی (الحر) وردە وردە بەرز دەبێتەوە، (المختار) دەیەوێ بۆلای خۆی سەرنجی ڕابكێشێ، بەڵام (ابن حر) وەڵامی ناداتەوە، بۆیە (المختار) خانووەكەی لە (كوفە) دەڕوخێنێ و ژنەكەی زیندانی دەكات، بەڵام (ابن الحر) توانی بڕواتە ناو (كوفە) و ژنەكەی لەزیندان ڕزگار بكات، لە گوێ نەدان بە فەرمانبەران و یارانی (موختار)، دیسان هەڵسا بە دەسەڵاتگرتن بەسەر كەلوپەلی (عبدالرحمن بن سعید)داو تاڵانی كرد،بۆ زانین (عبدالرحمن) سەربە لایەنگرانی (المختار الثقفي) بوو(١١٠).

ئەدگاری بزووتنەوەی (الحر) لەوە دابوو چالاك و بەجوڵە بوو،كە دەهاتە شارەكان سامانەكانی لەدەستی والیەكان و فەرمانبەران دەردەهێناو بۆ (الجبل) یان چیا دەگەڕایەوە، بەلاّم دیار نییە چەندە بەشداری كردووە لەم بزووتنەوەیەدا، بەلاّم دوور نییە ئەو خزابێتە ناویەوە، چونكە ولاّتی ئەو مەڵبەندە چالاكی بزوتنەوەكە بووە، ئەم بزووتنەوەیە، تا ساڵی (٦٨ك/ ٦٨٧ز) دەوام دەكات، تا لەلایەن ئومەوییەكانەوە لەبەین دەبرێت)(١١١).

## ە-بزووتنەوەی (یزید بن المهلب) (١٠١ك/ ٧١٩ز):

(یزید) لەسەردەمی (یزید بن عبدالملك)دا (١٠١-١٠٥ك/٧١٩-٧٢٣ز) دەست بەسەر (بەصرە) دادەگرێ و خەلیفە (یزید) لەسەركار لادەبات، (مروان بن المهلب)ی برای لەشوێندا دیاری دەكات، ئەنجا ڕوودەكاتە شاری (واسط) (١١٢).

دوایی راوێژ بە برادەرانی دەكات ،كوێ پێویستە بۆی بڕوات و كۆچی بۆ بكات، بەمەبەستی پشت گیری كردن و بلاّوكردنەوەی بزوتنەوەكەی، پێیان وت: پێمان باشە بڕۆیە ولاّتی فارس، دۆڵ و شیوەكان و كۆسپەكان بگرێ، بچییە (خوراسان) قسە لەگەڵ خەڵكیدا بكەی، خەڵكی (الجبال) بەرەو ڕووت دێن، تۆ قەلاّو حەسارت لەبەردەستدا دەبێت، بەلاّم (یزید) بەقسەی نەكردن، لە (واسط) مایەوە، لەوێ لەكاتی بەرەو ڕووبوونەوەی لەگەڵ والیەكانی ئومەوییەكاندا لەساڵی (١٠٢ك/٧٢٠ز)دا كوژرا(١١٣).

دەردەكەوێ وەكو (الطبري) باسی كردووە، خەڵكی (الجبال) ڕوو دەكەنە بزووتنەوەی (یزید) و باشترین پاڵپشتی دەكەن (١١٤).

### و-شۆڕشی (زيد بن علی) له (١٢٢ك/ ٧٣٩ز):

(زيد) نەوەی ئیمام عەلی یە (رەزای خوایان لیّ بێت) جاڕی شۆڕشـیدا لـە دژی دەوڵەتی ئومەویدا (١٢٢ك/٧٣٩) لەشاری كوفەدا، كە خەلافەت لەدەست (هشـام بـن عبـدالملك)و (١٠٥-١٢٥ك/٧٢٣-٧٤٣) بـوو، ئـەم بزووتنەوەیـەش وەكـو بزووتنەوەكانی تر، (الجبال) و (الجزیرە) دەكەنە پەناگەو مەڵبەندی بزوتنەوەكـەیان ، (زيد) لەسەردەستی والیەكانی خەلیفە (هشام) لەساڵی (١٢٢ك/ ٧٣٩ز) لەكوفەدا شەهید دەكرێت(١١٥).

### ز-بزووتنەوەی (عبدالله بن معاويه) (١٢٧-١٢٩ك/٧٤٤-٧٤٦ز):

(عبـدالله بـن معاویـە) لەسـەر شـانۆی سیاسـی (١٢٧ك/٧٤٤ز) لـە كوفـە دەركەوت، بانگەشەی بۆخۆی كرد، چووە (المدائن) و لەوێوە بەرەو هەرێمی (الجبال) كەسانێكی كوفە یاوەری بوون، توانی دەسەڵات بەسەر شاری (حلوان) و (همـدان) و (اصبهان) و (الری) و (الجبال)دا بگرێ، تـوانی بـارودۆخی ناهـەمواری خەلافـەتی ئومەوی بقۆزێتەوە، بەڵام بزووتنەوەكە سەری نەگرت و لەسـاڵی (١٢٩ك/٧٤٦ز)دا تێكشكاو سەركەوتن یاوەری نەبوو(١١٦).

لەم گێڕانەوانەدا و ژمارەیەكی زۆر دەقی مێژوویـدا، كە (الطبري) ئامـاژەی بـۆ كردوون، دەتوانین بەو ئاكامە بگەین،كە كوردەكان لـە زۆربـەی ئـەو بزووتنەوانـەدا بەشـداریان كردووە،كـە لـەدژی دەوڵـەتی ئومەویـدا بـەرپا كـراون، چـونكە ئـەم بزووتنەوانـە بـۆ چـالاكی نەیارەكەیانـدا، كوردسـتان دەكەنـە مەڵبەنـدو لـەبواری سـەربازیی و سیاسـیدا بـەكار دەهێـنن، سـەرباری بێـزاری كـورد و مەوالییـەكان بەگشتیی لەسیاسەتی ئومەویيەكان و رەگەزپەرستییان لەسەر حیسابی ئەو گـەل و نەتەوانەی هاتوونە ناو ئیسلامەوە.

# باسی چواره‌م

## كوردو بانگه‌وازی عه‌بباسی:

هه‌رێمی خوراسان و ده‌ڤه‌ره‌كانی خۆرهه‌ڵات، كه‌ سه‌ربه‌ خه‌لافه‌تی ئومه‌وی بوون، له‌سه‌ره‌تاكانی سه‌ده‌ی دووه‌می كۆچی- هه‌شتی زاینیدا، چه‌ندان بانگه‌وازی نهێنییان به‌خۆوه‌ بینی، كه‌مۆركێكی ئاینی سیاسییان وه‌رگرتبوو، یه‌كێ له‌وانه‌ بانگه‌وازی (عه‌بباسی) بوو، كه‌ چه‌ند ئامانجێكی زۆر و مه‌به‌ست و مه‌رامێكی بێ سنووریان هه‌بوو، كوده‌تایه‌كی سیاسیی و كۆمه‌ڵایه‌تیی گشت گری ده‌گرته‌ خۆیه‌وه‌، له‌وانه‌ ڕووخاندنی ده‌وڵه‌تی ئومه‌وی و دانانی به‌نو هاشم له‌ شوێنیاندا وه‌كو جێگره‌وه‌یه‌كی سیاسی (١١٧).

بۆ هێنانه‌دی ئه‌و ئامانجه‌ به‌رزانه‌، بانگخوازو كادیرانی، سه‌ره‌تا هه‌ڵسان به‌ بڵاوكردنه‌وه‌و بیروڕایه‌ سیاسیی و ئاینیه‌كانی ئه‌م بانگه‌وازییه‌، هه‌ڵسان له‌ته‌واوی خه‌لافه‌تی ئومه‌ویدا، به‌تایبه‌تی ناوچه‌كانی خۆرهه‌ڵاتی پایته‌ختی ئومه‌وی (دیمشق) (١١٨)، چونكه‌ به‌شی زۆری دانیشتوانی (مه‌والی) بوون، وه‌كو (ئیقلیمی جیبال) و ئه‌هواز (خوزستان) و فارس و سجستان ته‌بره‌ستان (١١٩) و شوێنی تر، دیسان په‌یمانییان به‌وانه‌دا چاره‌سه‌ری گونجاو بۆ كێشه‌ كه‌ڵه‌كه‌ بووه‌كانیان ده‌دۆزنه‌وه‌، شایانی باسه‌ كوردستانیش وه‌كو مه‌والییه‌كانی تر، ده‌كه‌ونه‌ ژێر كاریگه‌ری بانگخوازانی عه‌بباسیه‌كان و پڕوپاگه‌نده‌كانیان، له‌ڕووی ناردنی هێزی

سەربازیشەوە لەشكری عەبباسیەكان لە خوراسانەوە بەرەو هەرێمی تەبرەستان و جورجان (گورگان) هێرشیان بردو لەوێوە بەرەو عێراق لەشكر كێشیان كرد(١٢٠).

لەڕاست ناوچەی خۆرئاوای هەرێمی (جیبال) پێشەنگی سوپای عەبباسی لەسەرەتای (١٣١ك/ ٧٤٨ز) دەگاتە ئەوێ، سەركردەی عەبباسی (قحطبة بن شبيب الطائي) لە (الری) دابەزی و (حسن)ی كوڕی، ڕەوانەی شاری (هەمەدان) كرد، بەمەبەستی ڕاوەدوونانی سوپای تێشكاوی ئومەوییەكان(١٢١).

(حسن) لەدووری چوار فەرسەخ (٢٤ كم) لەشاری (نەهاوەند) ئۆردوی سەربازی داكوتا، باوكیشی بەهێزی سەربازی تر كۆمەكی كرد (١٢٢).

(مالك بن ادهم) كە فەرمانبەری ئومەوییەكان، خۆی بەتەواوی قایم كرد، بەلاّم سوپای عەبباسی (مالك)یان ناچار كرد خۆی و شامیەكان بەدەستەوە بدات و داوای ئەمان بكات، ئەوانیش ئەمانیان دایەو شمشێری خستە سەرگەردنی خوراسانییەكانو كەمێك نەبێ دەرنەچوو (١٢٣)، پاشان سوپای عەبباسی توانییان (حلوان) و (قرماسین) یان كرماشان و خانەقین (١٢٤) و گوندەكانی دەوروبەری بگرن(١٢٥)، بەلاّم خێرایی هاتنەپێشی سوپای عەبباسی بەشارەكانی خۆرئاوای هەرێمی (الجبال)دا دەكرێ بەوە مانابكرێ كە دانیشتوانیان مەیلیان بۆ بانگەوازی عەبباسی هەبووە، كە ئاسانكارییان بۆ ئەوان كردووە و یارمەتییان داون.

لەشكری عەبباسی بەرەو (شارەزوور) ملی ڕێگای گرت و لەتێشكاندنی سوپای ئومەوییدا سەركەوت، سەركردەی ئومەوییان بەناوی (عثمان بن سفيان) و زۆربەی یارانیەوە كوشت (١٢٦).

بەلاّم (الطبري) لەگێڕانەوەی تردا باس دەكات (عثمان) ناكوژرێ، بەلْكو بەرەو لای (مروان بن محمد) (١٢٧) ڕادەكات.

لێرەدا دەردەکەوێ کورد چەندە ڕۆڵی گێڕانەوەو بەشداری کـردووە لـە لەشـکری عەبباسیدا، (ابو الفداء) ئاماژە بە دەوری کورد دەکـات لـە (شـارەزوور) (١٢٨)دا، پاشان زۆری پێ نەچوو سوپای عەبباسـی لەشـارەزورەوە ڕووی کـردە زێـی گـەورە، (الازدی) باس دەکات زۆربەی سـوپای عەبباسـی لەجـەنگی (زێ)دا، کوردەکـان و شارەزوریەکان بوون (١٢٩).

بەشداری کوردی شارەزورو کەسانی تر لەسـوپای عەبباسـیو خزانـی کـورد بـۆ لایەنی دووەم، بەمەبەستی ململانێکردنی ئومەوییەکان دەمێنێتـەوە، هەرچـەندە دایکی (مەڕوان) کوڕی (محمد) لەڕەچەڵەکدا کورد بووە (١٣٠).

ڕاستە ئەوپەنا بۆ خاڵۆکانی دەبات، نابێ لەیادمان بچێ (مەڕوان) فەرمانبـەری (هشام بن عبدالملك)ی دەسەڵاتدار ئەو حوکمی خەلافەت دەست بخات (١٣١).

زانراوە کە زۆربەی جەنگاوەرانی ئەو لەجەنگی زێ (الزاب)دا خـەڵکی جـەزیرەو شام بوو (١٣٢).

ڕۆڵی کەسایەتییە کوردییەکان لە دامودەزگای سـەربازیی و ئیـداریی دەوڵـەتی عەبباسیدا:

کەسایەتییە کوردییەکان، کـە (الطـبري) لەمێـژووی (الرسـل والملـوك)دا باسـی کردوون ئەوانەن:

### ١-(حرب) کوڕی (عبدالله)ی ڕاوەندی:

(الحرب) بووە پاسەوان و فیدائی (بەغـداد) دوای (نەینـەوا)، ئەمـەش لـەکاتێ دابوو (ابی العباس)ی خوێن ڕێژ خەلیفە بوو، (ابو جعفر المنصور) والی بوو بەسـەر نەینەوادا و دوایی بووە خەلیفەی عەبباسـی، (الحـرب) لەپایـەی خـۆی دانەبەزییـە خوارەوە (١٣٣).

(ابو جعفر) ڕۆڵێکی تری دایه دەست (الحرب)ەوە، ئەویش جەنگی خەواریجەکان بوو، کە خەریکی سەربزێوی و جوڵەبوون لەدەوروبەری نەینەواو جەزیرەدا، نزیکەی (٢٠٠٠) جەنگاوەری لەبەردەستدابوو (١٣٤).

کاتێ شۆڕشی سەید (محمد) ناسراو بە (نفس الزکیە) (ڕەزای خوای لێ بێت) لەمەدینەدادەستی پێکرد، براکەی سەید (ابراهیم) (ڕەزای خوای لێ بێت) لە بەسرەدا (١٤٥ك/٧٦٢ز) کەلەبنەماڵەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خەلیفە مەنسور فەرمانی دەرکرد بە (حرب بن عبدالله الراوندی) بەرەو روویان بڕوات تا هەردوو شۆڕشەکە دامرکێنێتەوە، لەیەك کاتدا، بەڵام نەیتوانی سەربکەوێ چونکە خەڵکی گوندی (باحشما) ڕێگاپان پێگرت و بواریان نەدا بڕوات، چونکە خەڵکە کە زۆر ڕقیان لە خەلیفە مەنسوڕ بوو (١٣٥).

(الطبري) باسی (حرب بن عبدالله) دەکات، کاتێ لە (١٤٧ك/ ٧٦٤ز)دا لەلایەن (استرخان الخوارزمی) ئەرمینیا تووشی سامانی موسڵمانان و دیل گرتنی ژن و منداڵی (اهل الذمة) دەبن، هەڵدەستن دەچنە شاری (تفلیس)ەوە(١٣٦)، کاتێ هەواڵ دەگاتە خەلیفە مەنسوڕ، سەرلەشکر (جبریل بن یحیی) ڕەوانە دەکات، فەرمان دەکات بنێرن (حرب بن عبدالله) لەگەڵیدا بڕوات، ئەوانیش شان بەشانی یەکتری چوونە (تفلیس)، بەڵام (استرخان) جەنگەکی خەستی بەرپاکرد، (الحرب)یش لەشەڕەکەدا کوژراو (جبریل) شکست خواردبوو (١٣٧).

لێرەدا دەردەکەوێ کورد ڕۆڵی تایبەتی یان هەبوو، لە پاراستنی ئاسایشی دەوڵەتی ئیسلامی داو پاراستنی بەرژەوەندی خەلافەتی عەبباسیدا، هەروەها بەشداری کردنییان لەبەرنگاربوونەوەی زۆربەی ئەو پەلامارانەی خەلافەتی عەبباسی تووشیان هاتووە، لەناوەوەدا وەکو لەگەڵ خەواریجەکان و سوێند

خوارەکانیان، یان لەدەرەوەی ولاٚتی خەلافەتدا لەلایەن رۆم و ئەرمەن و کەرەج و ڕوس و خزردا.

## ب-(محمد بن الحسن بن جليويه الكردی):(١٣٨)

کۆمەکی (عوکبرا)(١٣٩) لەساڵی (٢٥١ك/ ٨٦٥ز)دا بەدەست (علی الرزان)ەوە بوو، پیاوێکی (المغاریە) بوو بڕە ماڵەکەی کەوتە بەردەستی و لەسەردەمی خەلیفە (المستعین)دا (٢٤٥-٢٥٢ك/ ٨٥٩-٨٦٦ز) سامانەکەی بۆ ڕەوانە نەکرد، لەلایەن (المعتز)ەوە هاندرا(١٤٠)، کاتێ (محمد) سەربە (المستعين) بوو لەبەرەی ئەودابوو، بۆیە بەرەو (علی الرزان المغربی) چوو، داوای لێکرد ئەو سامانەی کۆی کردۆتەوە ڕەوانەی بکات، بەلاٚم یاخی بوو لە تەسلیم کردنی سامانەکە بەنوێنەری خەلیفەو بڕواپێکراوەکەی و ئامادەی شەڕکردن بوو، پاشان شەڕی لەگەڵدا کردو بەدیلی گرت و بردییە لای (محمد بن عبدالله)و، ئەو سامانەشی برد، کەدەگەیشتە(١٢) هەزار دینارو (٣٠) هەزار درهەم لەلایەن ، (محمد بن عبدالله) بە(١٠) هەزار درهەم خەلاٚت کرا (١٤١).

## ج-(احمد بن الليث الكردی):

(الطبري) لە ڕووداوی (٢٥٦ك/ ٨٩٦ز)دا باس دەکات، کە لەماوەی خەلافەتی (المعتمد علی الله)دا سەرکردەیەکی کوردی بەناوی (احمد بن الليث الكردي) سەرهەڵدەدات، خەڵکی فارس دەبێ، بە سوپا کوردییەکەی دەورێکی بالاٚ دەبینێ لەبەرەنگاربوونەوەی (الصفارين)دا (١٤٢) لە هەرێمی فارس و کرماندا (١٤٣).

لەکاتێدا (يعقوب بن ليث الصفار) ویستی دەسەلاٚتی خۆی بسەپێنێ بەسەر کرمان و فارسدا (١٤٤).

کاتێ خەلیفە (حارث بن سیما الشرابي) کردە فەرمانبەر بەسەر فارسدا (٢٥٦ك/ ٨٩٦ز)دا، (احمد بن الليث) و (محمد بن واصل) ڕێککەوتن شەڕ لەگەڵ والی تازەدا بکەن، توانییان (الحارث) ڕاوبنێن و پاشان بیکوژن و ناوچەی فارس ژێر دەستە بکەن(١٤٥).

دەسەڵاتی (محمد) و (احمد) بەسەر هەرێمەکەدا تا ساڵی (٢٥٨ك/ ٨٧١ز) دەوامی کرد، لەم ماوەیەدا (موسا بن مهران الکردی) کۆمەکی کردن، کەخاوەنی یەکێ لە یەکە ئیدارییە نیمچە سەربەخۆکان بوو، کەبە (الزم) ناسراوە لەفارسدا، هەمان ساڵ (محمد بن واصل) ملکەچی بۆ دەوڵەتی عەبباسی ڕاگەیاندو داهاتوو سەرانەو باجی وڵاتی فارسی تەسلیم بە (محمد بن الحسين الفياض)(١٤٧) کرد، هەرچی (موسی بن مهران)ی کوردی بوو تا ساڵی (٢٦١ك/ ٨٧٤ز) لەسەر دەسەڵات مایەوە، تا (یعقوب بن الصفار) لەگەڵیدا دەکەوێتە شەڕ، چونکە یارمەتی (ابن واصل) داوەو تێکی دەشکێنێت (١٤٨).

سەرچاوە مێژووییەکان باس لە کەسایەتی یەکی تری کوردی دەکەن بەناوی (علی بن داود رهزاد الکردی) (١٤٩)، (الطبري) بەتەواوی ئاماژە بە ناوەکەی ناکات و تەنیا (علی بن داود) ناوی دەبات، ئەمەش دەبێتە لەکەو رەخنەیەك بۆ (الطبري) کە ناوی سەرلەشکرو سەرکردە کوردییەکان بە تەواوی باس ناکات و نازناوی کوردییەتی، یان وەکو مێژوونووسەکانی تر دەقرتێنێت.

وادیارە ئەم (علی)یە قسە لەگەڵ (اسحاق بن کنداج)دا دەکات بەسەر خەڵکی نەینەوادا لەساڵی (٢٢٦ك/ ٨٧٩ز)دا لەوکاتەدا ناکۆکی کەوتە نێوان (اسحاق بن کنداج) و (احمد بن موسی بن بغاء) لەناوچەی (الربیعە)، (اسحاق) زۆر لە (احمد) تورەبوو، وازی لە سوپاکە هێناو خۆی و دەستەکەی ڕوویان لە (بلد) کرد، دیارە پەیوەندی نێوان (اسحاق) و (علی بن داود) چووە قۆناغێکی خراپەوە، کە لەتوانا

بەدەردەبێ (١٥١)، لەبەرئەوە (علی) هەڵیکوتایە سەر کوردەکانی (اليعقوبيە) و تێکی شکاندن و تالانی کردن، بەمەش بەهێزتر بوو، (علی)بەرەو (نيساپور) (١٥٣) ڕای کرد، (حمدان بن حمدون)ی لەگەڵدابوو، بەڵام (اسحاق بن ايبو) داوای پەنابەری لە (عيسی بن الشيخ) کرد، گەورەی (ئامێدی) بوو، لە گروپ و پارانی (علی بن داود) بوو (١٥٤).

بەڵام لەڕاست بوونی کورد لەڕیزەکانی سوپای یاسایی دەوڵەتی عەبباسیدا زانیاری زۆر لە ئارادا نییە، جگە لە دوو دەق نەبێ، یەکەم: بوونی سوپای (بدر الغلام) لای خەلیفە (المعتضد) (٢٧٩-٢٨٩ك/ ٨٩٢-٩٠١ز) (الطبري) ئاماژە بە هەبوونی سوپایەکی زۆری کوردو خەڵکی (الجبل)دا دەکات، لەگەڵ (بدر)دا لەکاتی مەیداندارکردنیدا لەگەڵ خەلیفە (المكتفی)دا (٢٨٩-٢٩٥ك/ ٩٠١-٩٠٧ز) و وەزیر (قاسم بن عبيدالله)(١٥٥)دا.

دەقی دووەم (ابن ابی الحديد) باس دەکات، کاتێ (الموفق) برای خەلیفە (المعتمد) (٢٥٦-٢٧٩ك/ ٨٦٩-٨٩٢ز) گەمارۆی شاری (المختاره) دەدات لەساڵی (٢٦٧ك/ ٨٨٠ز)دا، لەسوپای مەولاکەیدا (ڕاشد بن غلمان) هەبووە لەکوردەکان(١٥٦).

هەرچی (الطبري)یە پشتگیری لەمە ناکات، کە باسی ئەوە دەکات (غلمان بن ڕاشد) لە ڕەگەزی (تورك) و خەزەر(١٥٧) و ڕۆم و دیالمە(١٥٨)و مەغاریبە(٢٥٩)و زنج(١٦٠)و تەبەرییە بووە!

ئەو بزووتنەوانەی کورد لەدژی خەلافەتی عەبباسیدا، بەشداریی بەرهەڵستی یەکانی کردووە:

أ-کوردو خەواریج: پەیوەندی کوردو خەواریج و وڵاتی ئەوان بۆ سەرەتای سەرهەڵدانییان دەگەڕێتەوە، کاتێ خەواریجەکان سوپای پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو

تالیب (سەلامی خوای لێبێ) بەجێ دێڵن لـە ڕووداوی (صـیفین) دا (١٦١) لەسـاڵی (٣٧ك/ ٦٥٨ز)دا سەرلەشکری ئەوان بەناوی (عبدالله بن وهب الراسبی) وتووێژیان لەگەڵدا دەکات: ئێمە لەو وڵاتە ستەمکارە دەربچـوێنن بـەرەو هەنـدێ کورەکـانی (الجبال)، یان هەنـدێ لەوشـارانە، ئـەو بیدعـە گومڕایـە نکـوڵی لێبکـەن، ئـەوان چیاکانیان بەپەناگەو قەڵایەکی بێ ترس داناوە بـۆ پاراسـتنییان لەهێرشـی سـوپای ئومەوییەکانـدا (١٦٢)، خەواریجـەکان ناوچـەی (شـەهرەزور) و (جـەزیرە) دەکەنـە مەڵبەندی جوڵەو سەربزێوییەکانیان، لەمەڕ ئـەوە کـورد لـەو ناوچـانەدا بەشـداری بزووتنەوەی خەواریجەکانیان کردووە، لەوانە:

## ١-بزووتنەوەی (الولید بن طریف الشاري) (١٧٨-١٧٩ك/ ٧٩٤-٧٩٥ز):

(الطبري) ئاماژە دەکات کـە (الولیـد بـن طریـف الشـاری) لەسـاڵی (١٧٨ك/ ٧٩٤ز) بەجەزیرەوە دەردەچێ و سەرلەشکرییان دەکات لە (نصیبین)داو (ابراهیم بن خازم بن خزیمە) لەناو دەبـات، دوایـی بـەرەو (ارمینیـا) (١٦٣) کەوتـە ڕێ، لـەناو ڕووداوی (١٧٩ك/ ٧٩٥ز)دا ئاماژە بۆ گەڕانەوەی (طریف) دەکات بەرەو (الجزیـرە) و بـەهێزبوونی تواناکـانی و زۆربـوونی پـەیڕەوانی، ئەمـەش بەڵگەیەکـە لەسـەر بەشداری دەڤەرەکە لەبزووتنەوەکەدا، چونکە زۆربەی دانیشـتوانەکەی کـورد بـوون، لەبەرئەوە (خەلیفە هارون ڕەشید (١٧٠-١٩٣ك/ ٧٨٦-٨٠٨ز)دا (یزید بـن مزیـد الشیبانی) دەنێرێتە سەریان و دەسـتە و دائیرەکـەی لـەناو دەبـات و پەرتـەوازەیان دەکات (١٦٤).

### ٢-بزوتنەوەی (جراشة بن شيبان الازردی):(١٦٥)

(الطبري) زانیاری تەواو لەبارەی ئەم بزووتنەوەیە نابەخشێ، تەنیا لەناو ڕووداوەکانی (١٨٠ك/ ٧٩٦ز)دا ئاماژەیان بۆ دەکات کە (جراشة الشيباني کمشری) حوکمی تێدا دەکات لە جەزیرەداو (مسلم بن بكار) دەیکوژێت (١٦٦).

لێرەدا دەردەکەوێ جەزیرە دەبێتە مەیدانی چالاکییەکانی (جراشە) و بەشداری کردنی لەناو ناوەندەدا.

### ٣-بزوتنەوەی (ابی عخمورد الشاری) (١٨٤ك/ ٨٠٠ز):

دیسان دەبینین (الطبري) لەراست ئەم بزوتنەوەیە قسەی نەکرووەو زانیاری تەواوی نەبەخشیوە، تەنیا لەناو رووداوەکانی (١٨٤ك/ ٨٠٠ز)دا باسی کردووە و دەڵێ: (ابو عمر الشاری) هەڵگەڕایەوە و سەری هەڵدا، (زهير القصاب) بەرەو ڕووی بۆوەو لەشارەزوور(١٦٧)دا کوشتی، ئەم سێ بزوتنەوەیە لێرەو لەوێ لەیەکترەوە پاڵپشتی یەکتریی بوون و درێژەیان بەیەکتریی داوە.

### ٤-بزوتنەوەی (عبدالسلام) لە (ئامێد): (١٨٧ك/ ٨٠٢ز):

دەبینرێ (الطبري) تەنیا باسی ئەم بزوتنەوەیەی کردووە و (ابن الاثير) لەوی وەرگرتووە، پێدەچێ ئەم بزوتنەوەیە خێرا دەرکەوتبێ و تەمەنی کورت بوبێ و ئەندامانی کەم بوبن، (الطبري) دەڵێ: (عبدالسلام) دەرچوو لە (ئامێد) لەساڵی (١٨٧ك/ ٨٠٢ز)دا و حوکمی تێدا گیرا،دوایی (يحيى بن سعيد العقيلي) دەیکوژێت (١٦٨).

## ٥-بزوتنەوەی (ابي العمود الثعلبي) لە (٢٤٨ك/ ٨٦٢ز)دا:

بەپێی گێڕانەوەی (الطبري) (ابا العمود) لە سولتەی عەبباسی یاخی دەبێ (٢٤٨ك/ ٨٦٢ز) بۆیە خەلیفە (ئەنوجوی توركی) دەنێرێتە سەر، بەپلان و فیلەکانی زەفەری پێ دەبات و لە (كفرتوثا)دا دەیکوژێت. (١٦٩)

ناوی ئەم دێیە پێ دەچێ لەکوردستان بوبێ، کە دێیەکی گەورە بووەو لەگەڵ چالاکییەکانی جەزیرەدا باسکراوە و لەنێوان (دارا) و (رأس العين) دابووە (١٧٠).

لێرەدا زۆر ڕای جیاواز لەسەر بنەچەی (مساور) گوتراوە، هەرچی (اليعقوبي)یە دەڵێ: (بني شيبان)ییە (١٧١)، بەڵام (ابن الاثير) بە (مساور البجلی) ناوی دەبات، (الطبري) بەگەورە پیاوێکی (البوازيج)ی دەیناسێنێ (١٧٣) بەڵام لێکۆڵەرێکی کوردی نوێ بەکوردێکی ڕەسەن ناوی دەبات (١٧٤).

(ابن خلكان) جەخت دەکاتەوە، (مساور) لە (بنو شيبان)ی عەرەبییە (١٧٥).

(مساور) هەر ڕەگەزنامەیەکی هەڵگرتبێ، سەرلەشکری بزووتنەوەیەکی خەواریجی فراوان و تەمەن درێژی کردووەو، هەڕەشەی گەورە بۆسەر دەسەڵاتی عەبباسی پەیدا دەکات و زیانێکی زەبەلاح لەهێزەکانی عەبباسی دەدات (١٧٦)، زۆربەی پەیڕەوانی کورد بووە، ئەم هێزە ناوچە کوردنشینەکان دەکەنە چەقی دەرچوون و حەوانەوەیان (١٧٧).

سەیر نییە کاتێ گوتمان ڕووداوەکانی (مساور) زۆرو زەبەندو درێژخایەن بووە، ئەوەی ئێمە مەبەستمانە باسی بکەین ڕۆڵی کوردە لەناویدا، (الطبري) لەناو ڕووداوەکانی (٢٦٠ك/ ٨٧٣ز)دا باسی دەکات.

یەکێ لەپیاوە کوردەکانی (مساور) دەتوانێ لەکاتی چوونیدا بەرەو سامەڕا، (محمد بن هارون بن المعمر) بکوژێ، کەللەسەرەکەی بۆ (مساور) بباتەوە، (حمدون) سەربەهۆزی (ربيعە)بوو، داوای خوێنەکەی کرد، خەلیفەی عەبباسی (مسرور

البلخی) بەبەشداری فەرماندەی سەربازی تر ناردەسەر (مساور الشاری) و، ڕێگاو بانەکانی لێگرتن، لەگۆشەیەکدا گەمارۆیدان، تا بەتەواوی کاری خۆی تەواو دەکات (١٧٩)، (الطبري) زانیاری تر نادات، تەنیا لە ڕووداوەکانی ساڵی (٢٦٣ك/ ٨٧٦ز)دا ئاماژە بەم ڕووداوەو مردنی (مساور الشاری) دەکات (١٨٠).

### ٧-بزوتنەوەی (هارون بن عبدالله الشاری):

ئەم بزووتنەوەیە درێژە پێدەری (مساور الشاری)یە، بەڵام (الطبري) زانیاری تەواومان پێنادات لەراست ئەم بزوتنەوەیەداو تەنیا لەناو ڕووداوەکانی (٢٧٢ك/ ٨٨٥ز)دا ئاماژەی پێ دەکات، کە (هارون الشاری) یارمەتی (حمدان بن حمدون) دەدات بۆچوونە ناو نەینەوا (موسڵ)ەوە، هەواڵ بە خەلیفەی بەغدا نەگەیشت تا هەردووکیان لە (هارون) و (حمدان) بوونە دەسەڵاتداری تەواو بەسەرشاری نەینەوادا (١٨١).

جارەکی تر (الطبري) ئەم ڕووداوە لەناو ڕووداوەکانی ساڵی (٢٨١ك/ ٨٩٤ز)دا باس دەکات، لەسەردەمی خەلیفە (المعتضد) (٢٧٩-٢٨٩ك/ ٨٩٢-٩٠١ز)دا، ئەم هەواڵەی نێوان کوردەکان و عەرەبەکان کە پەیمانییان بەستووە، دڵی خەلیفە نارەحەت دەکات، بۆیە بڕیار دەدات بەرەو نەینەوا دەربچێ، داوا لە (حمدان بن حمدون) بکات ئەم هاوپەیمانییە گومانـاوی و هەتیوە لەکرداردا هەڵوەشێنێتەوە، بەڵام کاتێ پەیڕەوانی (هارون) و (حمدان) لەکوردەکان و عەرەبەکان ئەم دەنگەیان بیستەوە، بڕیاریاندا هێزەکانیان ئامادەو یەك بخەن و سوێند بخۆن لەسەریەك خوێن بجەنگن، بەڵام سوپای خەلیفە لە ڕێگادا بەرەو نەینەوا لە (کرخ جدان) زیانەکی زۆر بە ڕیزەکانیان خست و ژمارەیەکی لێکوشتن و، هەندێ لە سوپاکەی لەزێدا(١٨٢) خنکاندن، دوای کۆمەڵێ سەرکەوتن خەلیفە بەسەر سوپاکەدا، نامەی (کرخ جدان)

گەیشت، کەچی خزمەتکارو کاسەلێسەکی خەلیفە بەناوی (الحرمی الخادم) ئاماژەی سەرکەوتن دەداتە خەلیفە، بۆیە خەلیفە بڕیاریدا کاروانەکە دەنگ بدات بۆ تەواوکردنی کاروانەکەی و بەرەو قەڵای (ماردین) بڕۆن (١٨٣)، دوای ئەوەی نەینەوا دەبڕێ، کە بەدەست (حمدان)ەوە دەبێ و ڕادەکات و کوڕەکەی لەشوێنی خۆیدا دادەنێ، خەلیفە هیچ بەرهەڵستییەك لەهێزەکانی قەڵاکەوە نابینێ، بۆیە زۆر بەئاسانی دەستی بەسەردا دەگرێ، سامان و تفاق و کەرەستەکان دەگرێ، پاشان فەرمان بەڕووخاندنی دەکات، دواجار زەفەر بە (حمدان) دەبات و زیندانی دەکات، بەمەش کاروانەکە نەگیرسایەوە، بەڵکو سەری نایە دوو، یەکێ لەپیاوانی (حمدان) بەناوی (شداد) کە سوپایەکی زۆری لەگەڵدا بوو، پێکدادانێکی زۆر لەنێوان سوپای ئەو و خەلیفەدا ڕوویدا، بەڵام خەلیفە توانی سوپای شەداد بشکێنێ و قەڵاکە بڕوخێنێ، کە ئاسایشی ناوچەکەو خەلافەتی خستبووە مەترسییەوە (١٨٤).

لێرەدا بەپێی ئەم دەنگ و دۆیانەی کە بۆمان ئاشکرا دەبێ، ئەم بزووتنەوەیەش لەناوچە کوردنشینەکاندا سەرهەڵدەدات و کورد ڕۆڵی بەرچاوی تێدا دەبینێ و ژمارەیەکی زۆری کورد بەشداری تێدا دەکات، دیسان دەبینین ئەم هاوپەیمانییەی نێوان کوردو عەرەب بۆ لابردنی ئەم ستەم و چەوسانەویە بووە، کە لەلایەن خەلیفەو والیەکانییەوە تووشیان هاتووە.

## ٨-بزووتنەوەی (بابکی خزمی/ ٢٠١-٢٢٣ك/ ٨١٦-٨٣٧ز):

بزووتنەوەی بابك گەورەترین کاردانەوەی مەوالیەکان بوو لەدژی حوکمی عەرەبی ئیسلامی عەبباسیدا،

(الطبري) ئاماژە، بەچەند ڕووداوێکی بزووتنەوەی (الخزمیە - المحمرە) دەکات، لەنێوان ساڵانی (٦٦٢ك/ ٧٧٨ز) و (١٨٠ك/ ٧٩٦ز)دا، لە (الجرجان - گورگان)دا،و لەساڵی (١٩٢ك/ ٨٠٧ز)دا لەهەرێمی ئازەربێجان دا بەر لە

دەرکەوتنی (بابك الخرمـی)دا، بـەڵام تەمـەنی کـورت بـوو لەگـەڵ سـەرهەڵدانیدا سەرکوت کرا (١٨٦).

بـەڵام بزووتنەوەیـەکی تایبەتـە بـە (بابـك الخرمی)یـەوە، (الطـبري) لـەناو ڕووداوەکانی ساڵی (٢٠١ك/ ٨١٦ز)دا باسی دەکات، تا (بابك) لە (جاویدانیە) وە دەست دەکاتە جولان، ئەوانە یارانی (جاویدان بن سهل) دەبـن، سـەرداری (البـذ) و بانگەشە دەکـات، کـە گیـانی (جاویـدان) چـۆتە لەشـیەوە، بۆیـە دەسـتی کـردە خراپەکاری و تێکدان (١٨٧).

(الطبري) ئاماژە دەکات ساڵی (٢٠٤ك/ ٨١٩ز) خەلیفە (مەئمون)ی عـەبباسـی (١٩٨ك-٢١٨ك/ ٨١٣-٨٣٣ز) لەژێر سەرلەشـکری (یحیـی بـن معـاذ) لەشـکرێ ڕەوانە دەکات، بەمەبەستی شەڕکردن لەگـەڵ (بابـك)دا، کـەس نـەیتوانی زەفـەری پێببات (١٨٨).

(الطـبري) قسـەکانی لەڕاسـت ئـەم بزووتنەوەیـە درێـژە پـێ دەدات لـەناو ڕووداوەکانی (٢٠٩ك/ ٨٢٤ز)دا باسی دەکات، کە (المـأمون) سـوپایەکی زەبـەلاح ئامادە دەکات، بەسەرلەشکری (صدقة بن علي بن زریق) کە دەیکاتە والی بەسـەر (ئەرمینیا) و (ئازەربێجان) بۆ شەڕکردن لەگەڵ (بابك)دا (١٨٩).

(مـأمون) ئامادەکـاری ئاسایشـی دژی (بابـك) سـازنەدات، بـەڵکو لەسـاڵی (٢١٢ك/ ٨٢٧ز)دا (محمد بن حمیدا الطوسي) ڕەوانە دەکاتە سـەر بـۆ شـەڕ لەگـەڵ کردن و بەرەنگاربوونەوەی و لەناوبردنی، توانی لەسەر ئەو ڕێگاپەی بۆ نەینەوا درێژ بۆتەوە خۆی دابکوتێت، کاتێ (محمد بن حمید الطوسي) لەگەڵ (بابـك)دا بـەرەو ڕوو دەبێتەوە لـە (بهشتادیسـر)دا دەکـوژرێ، ژمارەیـەکی چـاکیش خـەڵکی لەگەڵـدا دەکوژرێن.

مەئمون ساڵی ٢١٤ك/ ٨٢٩ز)دا (عبدالله بن طـاهر) ئاگادار دەكاتـەوە، كـەبۆ (الدينور) دەرچووە، سەرپشكی دەكات لەهەڵبژاردنی نێوان ویلایەتی (خوراسـان) و (الجبال) و (ئەرمينيا) و (ئازەربێجان) و شەڕی (بابك)دا، ئەو خوراسـان و جـەنگی خەوارجەكان هەڵدەبژێرێ بەسەر شەڕكردن لەگەڵ (بابك الخرمی)دا (١٩١).

دەتـوانرێ بگـوترێ سـەرجەم هەوڵـەكانی مـەئمون شكسـت خـواردو دەبـن، بزووتنەوەی (بابك) وردەوردە گەشـە دەكـات، بۆيـە كـاتێ كەوتـە سـەرەمەرگەوە (المعتصم)ی برای لەڕاست مەترسـييەكانی (الخرميـە) بۆسـەر دەوڵـەتی عەبباسـی ئاگادار كردەوە، بۆيە پێويستە تا كارەكان گەورە نەبوون و لەدەسـت دەرنەچـوون و نەگەيشتۆتە ولاتانی تر بە دەست و بردی لەناو ببرێـت، وەك دەڵـێ: (خەرمييـەكان داگـير بكـە، ئەوانـە ئـازاو نەبـەردن، بەسـامان و چـەك و سـوپای پيـادەو سـوار ئابلۆقەيان بدە، گەر زۆری پێ چوو، خۆت‌و يارمەتی دەران و لايەن گرانت بۆ ئـەوان ئامادە و دەست بەتاڵ بكە، بيكە بەيەكەم كارو نيازی خۆت، بەمەبەستی پاداشتی خودا)(١٩٢).

هەركە (مەئمون) مرد لەساڵی (٢١٨ك/ ٨٣٣ز) داو (موعتەصەم) هاتـە سـەر كورسـی خەلافـەت، وەك (الطـبري) بـاس دەكـات، خـەڵكی زۆری (الجبـال) لـە (هەمـەدان) و (اصـفهان) و (ماسـبذان) و (مهرجـان)دا خزانـە نـاو مەزهـەبی (الخزميە)وە، لە (همدان) كۆبونەوەو خۆيان بۆ سەربازيی ئامـادە كـرد، (المعتصـم) سوپای بۆ گردان، دوا سوپای (المعتصم) بەسەركردايەتی (اسحاق بن ابراهيم) توانی شكستەكی گەورە بەسەر ئەوان بـێنێ، بـەپێی گێڕانـەوەی (الطـبري) قوربانيـەكان دەگەنە (٦٠) هەزار كەس، گەر ئەم ڕێژەيە لەگەڵ جەنگـەكانی هاوچـەرخ بـەراورد بكـەين گـەلێ زۆر بـووە، پاشماوەكـەش لەمەيـدانی جەنگـەوە بـۆ ولاتـی (ڕۆم) ڕادەكەن) (١٩٣).

دیاره كه خەلیفه (المعتصم) مەسەلەی (الخرمیه) مەترسی گەورەی بۆ پەیدا كردووه، بۆیه ویستی (پایتەختی) له (بغداد) بۆ (سامراء) بگوازێتەوه، تا لێیانەوه نزیك بێ، لەنزیكەوه چاودێری هەڵس و كەوتیان بكات، بەپێی راسپاردەی خەلیفه (المأمون) بەر لەمردنی بڕوات (١٩٤)، بەتایبەتی پاش ئەوەی خەڵكی (الجبال) دەخزێنه ناو ڕیزەكانی بزووتنەوەكەیەوه.

لەبەرئەوه خەلیفه (المعتصم) لەساڵی (٢٢٠ك/ ٨٣٥ز) هەڵسا به ناردنی (ابا سعید محمد بن یوسف) بەرەو (ئەردەبیل)و دەسەلاتی پێدا ئەو قەلایانه دروست بكاتەوه، كه (بابك) لەمیان (زنجان) و (ئەردەبی)دا خاپوورییان دەكات، پیاوانی ئازاو بەتوانا دادەنێ لەسەر ڕێگادا بۆ پاراستنی ڕێگا لەوكەسانەی تفاق و ئامراز بۆ ئەردەبیل دێنن، دەبینرێ (بابك) سریەیەك بۆشەڕكردن لەگەڵ (ابا سعید)دا ڕەوانه دەكات، بەلام (ابا سعید) خەڵكی ناوچەكه كۆدەكاتەوەو هێرش دەكەنه سەر سریەی (بابك) بەشێك دەكوژن و بەشێك بەدیل دەگرن و بەشێك ڕاوەدوو دەنێن، ئەمه یەكەم تێكشكان دەبێ بەردەستەی بابك دەكەوێت (١٩٥).

(الطبري) لەگێڕانەوەیەكیدا ئاماژه بەبوونی كەسێك دەكات، بەناوی (ابن البعیث) قەلایەكی قایمی دەبێ بەناوی (شاهی)و قەلایەكی تری دەبێ بەناوی (تەبرێز)، ئەم كابرایه لەگەڵ (بابك)دا هاوپەیمانی دەبێ، كەپەیمانی پێدابوو لەكاتی ڕۆیشتنی بەولاتی ئەودا یارمەتی دەدات.

بابك بەپێی بەڵێننامەی (ابن البعیث) سریەیەكی سەربازی بەسەركردایەتی (عصمة الكردي) ڕەوانه كرد، بەلام (ابن البعیث) ناپاكی كرد، ترسی له (المعتصم) پاشگەزی كردەوه، چووه پێش كه (عصمه الكردی) بداته دەستەوه، گروپێكی لەدەست و دائیرەی (بابك) كوشت، كاتێ (عصمت) تەسلیم كرا، بەناچاری لەبەردەم خەلیفەدا هەموو نەخشەیەكی لەبارەی ولاتی (بابك)ەوه باس كرد، دواتر شوێنه

عاسێ و قایمەکانیان و قەڵاکانیان و سوپایان و هەموو زانیاریـەکی تـری پەیوەست بە بزووتنەوەی (الخرمیە) هەڵڕشت، پاشان خەلیفە خستییە زیندانـەوە، تـا رۆژانـی (الواثق) (٢٢٧-٢٣٢ك/ ٨٤١٠٨٤٦ز) مایەوە (١٩٦).

بەڵام لەڕاست (بابك الخرمی)دا (المعتصم) سەرکردەیەکی تورکی بەناوی (افشین) ڕەوانـە کـردە سـەر، بـەهۆی زۆری لەشـکر و تـاکتیکی سـەربازی و دوای گـرتنی سەرکردایەتی یان توانی شکست بە لەشکری (بابـك) بـینێ، کەلەشـاری ((البـذ)دا خۆی دەنواند (١٩٨).

(بابك) توانی لەدەستی (ئەفشین) خۆی قوتار بکات(١٩٩)، پەنا بۆ (ئەرمینیا) ببات، بەڵام (ئەفشین) توانی دووبارە یەخسیری بکاتـەوە، لـە (سـهل بـن سـنباط) یاریدە وەربگرێت، چونکە (بابـك) لای ئـەو داڵـدە دەدرێ و دەشـاردرێتەوە، بـەڵام (سهل) رادەستی (ئەفشین)ی دەکاتەوە، پاشـان ئـەویش لەگـەڵ (عبـدالله)ی بـرای ڕەوانەی لای خەلیفە (المعتصم)ی کـردن و لەسـاڵی (٢٢٣ك/ ٨٣٧ز) هـەردووکیان دەکوژێت (٢٠٠).

بەکوشـتنی (بابـك) موعتەصـەم و دەوڵـەتی عەبباسـی خـۆی لەدەسـت ئـەم مەترسییە گەورەیە ڕزگار کرد، چونکە بزووتنەوەیـەکی فـراوان و درێژخایـەن بـوو، دەستیان بەسەر ناوچەیەکی زۆردا گرتبوو لەناوچەکەدا بەهۆی زۆری پەیڕەوانیەوە.

## ب-کوردو شۆڕشی قولەکان (الزنج) (٢٥٥-٢٧٠ك/ ٨٦٩-٨٨٣ز):

پەیوەندی کورد بەشۆڕشی زنجەکانەوە بـۆ سـەرەتای دەرکـەوتنیان دەگەڕێتـەوە، لەکاتێدا (محمد عبیدالله بن اذار مرد الکردی) نامە بۆ (علی بن محمد* فەرماندەی (زنجەکان - قولەکان) دەنێری و بەناوی (بەهبـوذ) بەگوندی (رزنـین)دا، کـە سـەربە گوندی (الری) تەماعی دەداتێ دڵی بداتێ لەدژی (یعقوب بن الصفار) هاوپـەیمانی

لەگەڵدا ببەستێ، (محمد) چەند جاران نامەی بـۆ دەنێـرێ، تێیگەیانـد ئـەو کـوڕی (ئەهواز-خوزستان)ی تەسلیم دەکرێ، (الصفار) تا کاروبارەکانی بۆ هـەموار دەبـن وەڵامی ناداتەوە، دوایی وەڵامی دەداتەوە کە (علی بن ابان المهبلی) کـە یەکێکـە لەسەرکردە مەزنەکانی زنج دەکرێتە والي و (محمد بن عبـدالله) دەبێتـە جێگـــری ئەو (٢٠١).

(علی بن ابان) براکەی بەناوی (الخلیل بن ابـان) بەسـوپایەکی گـەورەوە ڕەوانـە دەکات، بە (ئازاد مەرد)ی کوڕی سوپایەکی تری کۆمەك دەکـات و سـەرکردایەتی بە (أبی داود الصعلوك) دەسپێرێت، هـەموویان بـەرەو (سـوس-شـوش) دەڕۆن تـا لەوێدا شەڕ لەگەڵ سوپای عەبباسی بکەن، سەرلەشـکری سـوپای عەبباسـی لـەوێ (احمد بن لیثویـة) دەبـێ، کـە (مسـرور البخلـی) بەسـوپایەکی گـەورە بـۆ ئـەوێ دەنێرێـت، (خلیـل) و (ابـو داود) نـاتوانن بگەنـە سـوس ڕێگایـان لێـدەگرن و شکستەکی خەستیان پێدێنن، (احمد) بەرەو (جندیسـابور) (٢٠٣) دەڕواتو بارگـەی لەوێ دەکاتەوەو (علی بن ابان) لە (ئەهواز)ەوە دەڕوات و داوای یارمەتی لە (ئازاد مرد الکردي) دەکات، ئەویش کوردو خەڵکی ڕەش و ڕووت کۆدەکاتـەوە دەڕۆن تـا دەگەنە سەربازگەی (مکرم) (٢٠٤).

(ابن اذار مرد الکردي) دەڕوات تا دەگاتە (علی بن ابان) کـەس لەگـەڵ خۆیـدا نابات، پێکـەوە ئاخـاوتن دەکـەن، پاشـان (ابـن ازار مـرد) بـەرەو لەشـکرگاکەی دەڕوات، (القاسم بن علی) سەرکردەیەکی کورد بەناوی (حازم الکردی) بەرەو (علی بن ابان) ڕەوانە دەکات، تێیان دەگەیێنێ (ابن ازار مـرد) لەگـــوێڕایـــەڵی تـــەواو دایە (٢٠٥).

پاشان زۆر نابـا (ابـن ازار مـرد) لەسـەربازگەکەی (رامهـر مـز)دا ڕوودەکاتـە (تستر- تشتر) (ابن ازار مرد الکردی) داوا لە (علی بن ابان) دەکات بۆ سەرکردەی

زنجەکان لەسەر مینبەرەکانی (تستر) وتار بدات، (علی بن ابان) پیاوێکی بەناوی (بهبوذ بن عبدالوهاب) نارد بەمەبەستی ئامادەبوون بۆ وتاری هەینی و هێنانی هەواڵی دروست و دووپات کردنەوەی نیازپاکی (ابن ازار مرد)، بەڵام ئەو وتاری لەبەرژەوەندی (خەلیفە معتمد) و (الصفار)دا دا، (بهبوذ) هەواڵەکەی بۆ (علی بن ابان) بردەو، لەبەرئەوە لەشکرێکی ئامادەکردو، بەرەو ئەهواز ڕێگای گرتەبەر، سەربازگەی (مکرم)ی لەڕێگادا بەتاڵان برد، کاتێ (احمد بن لیثویة) بەهاتنی زنجەکانی زانی چووە (تستر) و زیانێکی گەورەی بە (ابن ازار مرد) و پەیڕەوانی گەیاند، بەڵام (ابن ازار مرد) لەدەستیان ڕایکرد و قورتاری بوو، هەرچی (ابو داود الصعلوك) بوو یەخسیری دەستیان بوو، ڕاپێچی دەسەڵاتی عەبباسی کردو ڕەوانەی خەلیفە ((المعتمد)کرا (٢٠٦).

(علی ابن ابان) ئەوکارەی (ابن ازار مرد الکردی) بەسەری هێنا لەیادی نەکرد لەبەرئەوە (علی بن محمد) ڕقی لێداگرت، (ابن ازار الکردی) هەستی بەوە دەکرد، ویستی خۆی دەرباز بکات، بۆیە نامەی بۆ (ابن الخبیث) نووسی، کە فەرماندەی (زنجی ئەنکلای) بوو، باوکی کە سەرۆکی زنجەکان بوو ئاگادار بکاتەوە، تا هەردوولایان یەکتری بگرن و (رامهرز)ی بکاتە دیاری، ئەمەش زیاتر ئاشنای کرد، کە ئەو دەیەوێ زیان لە (ابن داود) بدات، ئەو مەسەلەی،کە دانی سەرانەدەکاتە پاساو بۆئەوە، سەرکردەی زنجەکانیش ڕێگای ئەوەی پێدا (٢٠٧).

(بن ازار مرد) لەلایەن (علی) نامەی بۆ نووسراوەو داوای دارایی لێکرد، ئەویش ڕێگریی کرد، بۆیە (علی) بە لەشکرێکی زۆرەوە چووە سەری‌و لە (راهرمرز) تووشی هات، لەوکاتەدا (ابن ازار مرد) لەوێ دادەنیشتن، ئەوەبوو ڕایکرد، (علی) چووە ناو (رامهرمزە)وە، (ابن ازار مرد) لەشوێنی خۆی لە (اربق) و (بیلم)دا خۆی قایم کرد، (ابن ازار مرد) ناچار بوو نامە بۆ سەرکردەی (زنجەکان)

بنووسێ، مەرجەکانی ئەوانی واژو کرد، (ابن ازار مرد) لەڕێگای (علی بن ابان)ەوە (۲۰۰,۰۰۰) درهەمی بۆ سەرلەشکری زنج (قولەکان) نارد، ئەویش دەستی لەناڕەحەت کردنی هەڵگرت (۲۰۸).

(الطبري) ئاماژە دەکات بۆ گێڕانەوەی تر لەڕاست ڕووداوێکدا کە لەنێوان کوردانی (داربان) و زنجەکاندا دەقەومێت، دەڵێ: هۆی هەڵگیرسانی ئەو ڕووداوە (ابن ئازار مرد) بوو، کە (ازار مرد) نامەیێ بۆ (علی بن ابان) دەنووسێ، داوای ئەوەی لێ دەکات سامانی بۆ ڕەوانە بکات، وەك باسمان کرد، ئەویش دەست لەئازاردانی هەڵدەگرێ، (ابن ازار) داوای کۆمەکی لە (علی بن ابان) دەکات بۆسەر کۆمەڵێ لە کوردانی (داربان) بۆ شەڕکردن لەگەڵیانداو تاڵانکردنیان و دابەش کردنی دەسکەوتەکە لەنێوانیاندا.

(علی) نامە بۆ سەرۆکی زنجەکان دەنێرێ بۆ ئەنجامدانی ئەو کردارە ڕێگاپیان پێبدات، سەرۆکی زنجەکان ڕێگایدا، بەومەرجەی خۆی نەڕوات و سوپا ڕەوانە نەکات، تا بەڵگەنامە و بارمتەو سوێندیان لەنێواندا نەبێت.

(ابن ازار مرد) لە سەر پەیمان و سوێند خواردنەکە ڕێکەوت و بارمتەی پێدان، (علی بن ابان) سووربوو لەسەر تاڵان، هانیدا سوپا بنێرێ، ڕۆیشتن تا گەیشتنە جێگای مەبەست، خەڵکی (داربان) چووە پێشیان، جەنگ هەڵگیرسا، سەرەتا شەڕەکە بەقازانجی زنجەکان تەواوبوو، بەڵام یارانی (ابن ازار مرد) بوونە هۆی شکست پێ خواردنیان، چونکە پاڵیان دایە کوردانی شاری (داربان) و توانیان شکستێکی گەورە بەزنجەکان بگەیەنن.

هەموو سوپاکە کەل و پاچ بوو، بەخەستی دۆڕانو، ئەوانەی ڕاشیان کرد بەسەرکەمین و بۆسەدا کەوتن کە، پەیڕەوانی (ابن ازار مرد) بۆی نابوونەوە، (۲۰۹).

بۆیه دەبینین (علی بن ابان) نامەی بۆ سەرکردەی زنجەکان نارد، هەواڵی شکست خواردنی زنجەکانی بەدەستی (ابن ازار مرد)ی کوردی بۆ نارد، ئەویش نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی بۆ ناردو پێی دەڵێ: (سەرەتا پێم گوتبوی پاڵ نەدەیە لای (محمد ابن عبدالله) تا بەڵگە نامەکەت لەسەر بارمتەبێ، بەڵام فەرمانی منت پشت گوێ خست و شوێن هەواو هەوەسی خۆت کەوتی، ئەمە بووە هۆی لەدەستدانی خۆت و لەشکرەکەت) (٢١٠).

سەرۆکی زنجەکان هەڕەشەی له (ابن ازار مرد) کرد، که ئەو لەسزای ئەو تاوانەی دەرحەق بەئەو کردوویەتی دەربازی نابێ، (ابن ازار مرد) ترسا، بۆیه بەلالآنەوە لێی پاڕایەوەو پەیمانی دایه، هەرچی تالآن و مەڕو مالآتی گرتوویانە ڕادەستی ئەوانی دەکەن، بانگێشەی کرد ئەو شەڕی کوردی (داربان)ی کردووە، بەڵام سەرۆکی زنجەکان بەقسەکانی ئەو بڕوای نەکرد، بۆیه ناچار بوو بەبڕە پارەیەك (بهبوذ)و (محمد) قایل بکات که ببنه ناوبژیی و ناوەندێك له نێوانیاندا) (٢١١).

ئەو دوانه توانیان بەسەرکەوتویی ڕۆڵەکه بگێڕن، (سەرۆکی زنجەکان) و (علی ابن ابان)یان ڕازی کرد، دوای ئەوەی هێرشی (رامهرمز) کرا، لەبەرامبەر ئەواندا لەسەر مینبەری مزگەوتەکاندا وتار بۆئەوان بدرێ، کەلەژێر دەسەلآتی (ابن ازار مرد) دانه، ئەویش بەهەموو داخوازییەکانی خاوەنی زنجەکان ڕازی دەبێ، فەرمان دەکات لەسەر مینبەرەکات دوعا بۆ ئەو بکرێت) (٢١٢).

(الموفق) لە (٢٦٧ك/ ٨٨٠ز)دا کاربەدەستی خۆی ڕەوانەی کورەی ئەهواز دەکات، تا ڕەواج بدات بەناردنی دارایی بۆئەو، بەمەبەستی زەمینه خۆشکردن بۆ پاکژکردنەوەی لەدەستی زنجەکان، (موفق) هەڵسا(احمد بن ابی اصبع)ی نارده لای (ابن ازار مرد)، که بەزمانی ئەو پێی بڵێ: ئەو لەیارمەتیدانی زنجەکان چاوی لێ پۆشیوە، بەومەرجەی ڕازی بوو) (٢١٣).

